# ڕشتەمرواری





کۆمەڵە ئەدەبییێکی هەرە بەنرخە
لە فەلسەفە و بیر و باوەڕی کوردی

عەلائەدین سەجادی



سرشناسه : سجادی، علاءالدین، ۱۹۰۷ - ۱۹۸۴م.
عنوان و نام پدیدآور : ڕشتەی مرواری: کۆمەڵە لەدەبییکی هەرە بەنرخە لە فەلسەفە و بیروباوەڕی کوردی/ دانراوی عەلالەددین سەججادی.
مشخصات نشر : سنندج : کردستان ، ۱۳۹۹.
مشخصات ظاهری : ۸ ج.؛ ۲۱/۵×۱۴/۵ س‌م.
شابک : دوره : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱۱-۸ / ج۱ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰٤۱۲-٥
ج۲ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱۳-۲ / ج۳ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱٤-۹
ج٤ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱٥-٦ / ج٥ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱٦-۳
ج٦ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱۷-۰ / ج۷ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱۸-۷
ج۸ : ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤۱۹-٤
وضعیت فهرست نویسی : فیپا
یادداشت : کردی.
موضوع : شوخی‌ها و بذله‌گویی‌های کردی-- عراق-- قرن ۲۰م.
موضوع : ۲۰th century -- Kurdish wit and humor-- Iraq
موضوع : داستان‌های طنزآمیز کردی
موضوع : Humorous stories, Kurdish*
رده بندی کنگره : PIR۳۲۵۶
رده بندی دیویی : ۸فا۹/۲۸۳۶۲
شماره کتابشناسی ملی : ۷۶۲۸۵۳۱
وضعیت رکورد : فیپا

# ڕشتەی مرواری

-٤-

کـۆمەڵە ئەدەبییێکی هەرە بە نرخە
لە فەلسەفە و بیروباوەڕی کوردی

دانراوی:

**مامۆستا عەلائەددین سەجادی**



انتشارات کردستان
سنه

# ڕشتەی مرواری

## ـ ٤ ـ


| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | ڕشتەی مرواری |
| ✓ دانراوی (مؤلف): | مامۆستا عەلائەددین سەججادی |
| ✓ پێداچوونەوە و هەڵەبژێری: | ژیلا قەوامی / ڕەفیق ڕۆستەمی |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول) ١٣٩٠ ـ ٢٠٢١ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ١٠٠٠ بەرگ (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕە و قەوارە (تعداد صفحات): | ٢٠٧ لاپەڕە (صفحەی رقعی) |
| ✓ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کُردستان) |
| ✓ شابک: | دوره: ٨ ـ ٤١١ ـ ٩٨٠ ـ ٩٦٤ ـ ٩٧٨ ـ شابک جلد (٤): ٦ ـ ٤١٥ ـ ٩٨٠ـ ٩٦٤ ـ ٩٧٨ |





سنندج، چهارراه شهداء، پاساژ عزق، انتشارات کُردستان، تلفن: ٠٨٧ ٣٣١٦٥٣٨٢

سنە، پاساژی عیزەتی، بڵاوکردنەوەی کوردستان، تەلەفوون: ٠٠٩٨ ٨٧ ٣٣١٦٥٣٨٢

# ناواخن

# بردمانەوە یان نەء؟

ساڵی (١٩٥٧) بوو؛ بەرگی یەکەمی ڕشتەی مرواری دەرچوو. لەو بەرگەدا لە سەرەتاکەیا وتم: ئەم بەرگە دەرئەچێ زۆر کەس ئەکەونە تەقە کردن، بەڵام لە ئەنجاما وا نامێنێ و نرخی ئەزانرێ. زۆری پێ نەچوو هەر لەو ساڵەدا بەرگی دووەمیشی دەرچوو. بەرگی سێیەمی لە ساڵی (١٩٥٨)دا هات بە شوێنیا. ئیتر هەر لەو ساڵەدا دەزگای عێراق گۆڕا و وردەوردە دووکانێکی‌تر هاتە پێشەوە، هەردوو قسەکە هاتە دی؛ قسەی یەکەم کە زۆر کەس کەوتنە تەقە و دەستیان کرد بە ڕەخنە گرتن، بەڵام «بەرەکەت دا» من هیچ گوێم نەدایە.

بەرەبەرە قسە کەم بووەوە و وای لێ هات ئەوانەی کە زۆر لە دژی بوون، بە دزییەوە داوای خوێندنەوەیان ئەکرد. ئینجا کەوتە دەوری نرخ دەرکەوتن و نرخ زانینەکەی؛ سەیرم ئەکرد: ئەوانەی کە لە سەرەتاوە زۆر ڕەخنەیان لێ ئەگرت، ئەوانە زیاتر بە ئارەزوو بوون بۆ خوێندنەوەی و بۆ دەرچوونی بەرگی‌تری.

ئەمەش لەبەر چی بوو؟ دیارە ئەو دەستەیە کە ئەو بێزارییەیان لە شتی وادا دەرئەبڕی، دەستەیەکی خوێندەواری تێگەیشتوو بوون. لە باوەڕی ئەو ڕۆژەی ئەوانا بەلایانەوە وا بوو: نابێ ئەم جۆرە شتانە بکەونە سەر قاقەز و بکەونە بەردەمی هەموو کەسێکەوە. لە پاشا هەر

ئەو جۆرە دەستەیە خۆیان لە خۆیانەوە بۆیان دەرکەوت کە ئەمە ئەدەبە و کەلەپووری ئەدەبی ئێمەیە، نابێ سەریان تیا بچێ و لەناو بچن. لە ڕووی ئەم باوەڕەوە ئەوان گەلێ زیاتر بەشوێن بەرگە چاپ نەکراوەکانی‌تریا ئەسووڕانەوە. کە گەیشتنە ئەم شوێنە باوەڕی هەردوو لامان یەکی گرتەوە: کە ئەمانە ئەدەبی نەتەوەکەمانە و ئەبێ بمێننەوە. بەڵام عافەرەم بۆ خۆم! کە کۆڵم نەدا و پاڵم بە توانجەوە نا تا لەگەڵ ئەوانا بووین بە یەك. ئۆ! خۆزگەت پێ وێ قسەی پار ئەگێڕیتەوە.

ئەوەندە هەبوو لە ماوەی ئەم هەشت، نۆ، دە ساڵەدا هەر ڕۆژە سازێك و هەر دەمە ئاوازەیەك پەیدا ئەبوو. ئەو ساز و ئاوازەیە سەری لە دەستەی دووەم تێك دابوو، وای لێ کردبوون ئەو سۆزەی کە سەرەتا بۆ خوێندنەوەی شتی وا هەیان بوو، ئەو سۆزە ئاڵابوو بە باڵای شتی‌تر. بەرەبەرە بۆیان دەرکەوت کە ئەو شتانە هەموو پلوپووشن و با ئەیانبا؛ وەکوو بردنی. ئنجا ئەوانیش گەڕانەوە بۆ شتە بناغەییەکە؛ بۆ ئەو شتە کە ئێمەش نەتەوەیەکین و هەموو جۆرە ئەدەب و فۆلکلۆرێکمان هەیە و ئەدەب و فۆلکلۆرمان ئەگەر خۆیشمان بڕۆین، ئەوان ئەمێننەوە. کە ئەوان مانەوە، مانەوەی ئەوان مانەوەی خۆمانە؛ چونکە نەتەوەیەك ئەگەر بیروباوەڕ و زمانەکەی کەوتە سەر قاقەز و کەوتە بەرچاو، ئەو نەتەوەیە لەناوچوونی نابێت، با بە هەزاران تاوێریش بپلیشێنرێتەوە.

لەبەر ئەم شتانە و لەبەر ئەو هەموو ڕوو لێ‌نانە کە ڕوویان لێ ئەنام، بەتایبەتی لەم ماوەی دواییەدا، بۆ لە چاپدانی بەرگەکانی‌تری ئەم کتێبە، ئەوا منیش پاڵم نا بەو دیوارانەوە کە ئەهاتنە بەر و سەر ڕێگاکەم ساف کرد و کەوتمەوە مەیدانی لەچاپدانی بەرگەکانی‌تری «ڕشتەی مرواری».

جارێك لە مەدرەسەی تورجانی‌زادەکان فەقێیەك هەبوو لەلای مەلا عەلی گەورە خوێندبووی. مەلا عەلی عەمری خوا ئەکا و مەلا حەسەنی کوڕی لە جێگاکەی دائەنیشێ. کاکە فەقێ لەلای ئەویش ئەخوێنێ. مەلا حەمەحەسەن ژن دێنێ و کوڕێکی ئەبێ؛ کوڕەکە منالٚ ئەبێ، ڕۆژێك ئەیبەن بۆ حوجرەی فەقیەکان. کاکە فەقێ پڵتۆکێك ئەدا بە سەر ورگی منداڵەکەدا و ئەڵێ: «ئم! ورگە، ئەگەر نەمرین لای تۆیش ئەخوێنین» ئێستە منیش: «ئم! ورگە، ئەگەر نەمرین گەلێ بەرگی‌تری ئەم کتێبە ئەخوێنیتەوە».

ئەبێ ئەوەش بزانین: کە ئەرکی چاپیش لە چاو ئەو ساڵانەدا یەکاویەك زیادی کردووە.

**عەلائەددین سەججادی - بەغدا**

**١٩٦٨/٩/٢٥**



# تاڤگەی ئێلاخ

١. فەرامیرزا لە سنە، «بارام‌سان»ـی یەکەم لە هەورامان بانگ ئەکا بۆ سنە. ئەمیش بە چەند پیاوێکی خۆیەوە ئەچێت و میوانی حوکوومەت ئەبێت. ئەمان هەموو لە «دەرماڵ» ئەبن. بارام‌سان شوێنێکی شاهانەی بۆ تەرخان ئەکرێت، بەتایبەتی ژوورێکی ئاوێنەبەند ئەبێ لە دەرماڵەکە دانراوە بۆ پیاوانی گەورە، ئەمە دائەنێن بۆ بارام‌سان کە کەسی‌تری تیا نابێ.

شەوێك سان ئیشی سەر ئاوی ئەبێ کە هەڵئەستێ دەست ئەنێ بە دەرگاوە سەیر ئەکا دەرگا لەو دیوەوە داخراوە. ئەمەش ڕێکەوت بوو؛ ئەگینا هەموو وەخت وا نەبوو. بەمە زۆر تێك ئەچێ و خۆی ڕائەگرێ، بەڵام ئەو حاکمەی لە سکیایە لە فەرامیرزا حاکمتر ئەبێ. هەرچەند ئەکا هیچ چارێـك نادۆزێتـەوە. ناوسکی دەست ئەکا بە پـێ‌دان و قوڕەقوڕ کردن. ئۆقرەی لـێ هەڵئەگیرێ، دیسان هەر چار نییە؛ خەو، ئەوە هەر بە جارێ باری کرد. بێجگە لەمەش ئەیویست لەو کاتەدا هەورامانی لهۆن و ڕەزاو بدا هەر بەو شەرتە لەو بەڵایە ڕزگاری ببێ. بەم‌سەر و بەوسەری ژوورەکەدا هاتوچۆ ئەکا و پێچ ئەدا، لەو کاتەدا کە تۆزێك چار بە هەورامانی تەخت ئەکرێ چاوی بە تاقێکی ژوورەکە کەوت، کە مانگەشەو لە پشت شووشە و ئاوێنەبەندی تەلارەکەوە هاتۆتە ژوورەوە و داویە لەناو تاقەکە و بەم هۆیەوە هەندێ لە بن‌میچی ژوورەکەی

ڕووناك كردۆتەوە. بارام‌سان لەبەر ئەمە دنیا شەوە و لەبەر ئەمە كە ژان و پێچی ناوسكی هیچ هۆشێكی لا نەهێشتووە، وا تێ‌گەیشت كە ئەمە كۆڵانە. بەم بۆنەوە زۆری پێ‌خۆش بوو ڕێگا چارەی دۆزییەوە.

هێنای تاكێ لە گۆرەوییە پووزەوانەییەكەی خۆی وەكوو بۆڕییە نووسانی بە خۆیەوە، پڕی كرد. بە زیادە بەنەكەی توند شەتەكی دا و دوو سێ جار وەكوو قۆچەقانی چۆن ئەسووڕێنرێتەوە بە دەوری سەرا، بۆ ئەوەی بەردەكە زۆر بڕوا، ئەمیش سووڕاندیەوە و هاوێشتی بۆلای كۆڵانە خەیاڵییەكەوە. كوتوپڕ گۆرەوی پڕ لە خەستەی ئاردە تووی هەورامان و نیشاسەی پەشمەكی میوانخانەی فەرامیرزا بەو گورە ڕۆیشت و دای لە بن میچەكە و تلیشا و تەقییەوە و ژووری بلوورینی فەرامیرزای سیواغ دا.

بارام‌سان كە ئەمەی چاوپێ‌كەوت هەناسەیەكی ساردی هەڵكیشا و لە شوێنەكەی خۆی وشك بوو؛ ئەمجا كەوتە دەریای ئەو خەیاڵەوە كە لە پێش ئەوەدا ڕۆژ بێتەوە چۆن ئەم بن میچە پاك كاتەوە و چۆن ئیشێكی وا بكا كە ئابڕووی خۆی و عەشیرەتی نەچێ؟

پێش وەشاندنی ئەم دەستەگوڵە زۆر خەوی ئەهات، بەڵام حاكمی ناوسكی نەیئەهێشت. كە لەوە ڕزگاری بوو ئەمجا حاكمی ئابڕووچوون سەری لێ تێك دا بە كورتی نوستن نەما.

بەیانی زوو چووە بەر هەیوانی «سێدەری»ـیەكە كە ئەیڕوانی بەسەر كۆڵانا، سەیری كرد وا كابرایەك خەریكە كۆڵان گسك ئەدا. بانگی كردە لای خۆی. كابرا هات و پێی وت: تۆ ڕۆژێ چەند پارە وەرئەگری بۆ ئەم ئیشەت؟ [وتی:] ڕۆژی دوو قڕان. وتی: شوێنم كەوە.

خۆی پێش كەوت و ئەو لە شوێنیەوە تا بردیە ژووری بلوورینی بە پیسی هەنووراو، ئەسڵی شوێنەكەی پیشان دا و وتی: من سەد قڕانت

ئەدەمێ، بەبێ دەنگ هەر ئێستە ئەم شوێنەم بۆ پاك کەوە. کابرای گسکدەر سەیرێکی بن میچەکەی کرد و تێگەیشت کە چی پێوەیە، هەروا بە ساردییەکەوە وتی: «قوربان من دوو سەد قڕان ئەدەم بە جەنابت هەر ئەوەندە پێم بفەرمووی چۆن ڕیاندووتە بەو بن میچەدا؟!».

٢. لەو سەرە «خەتەنەسووران» بوو؛ چەند منالێکیان هێنابوو خەتەنەیان ئەکردن. چەند کچێکی منالیش لەوێ بوون. لە باتی ئەوە کوڕەکان بگرین، کەچی کچەکان ئەگریان. پێیان وتن: هی کوڕەکان ئەبڕن، ئێوە بۆچی ئەگرین؟ وتیان: «ئەوەی کە بەوانەوەیە نووکەکانیان بۆ ئێمە تیژ ئەکەن!».

٣. عەزیزخانی سەردار (عەزیزخانی گەورە) زۆر بە خۆشی و بە دەستووری خانەدانی پادشایی ڕایئەبوارد. یاسای دیوەخان و دیوەخانداری بەگزادەکانی موکری سەرمایەی هەموو قەڵەمێك بوو، عەزیزخان سەر باشقەی ئەمانە هەموو بوو. عەزیزخان چوار ژنی هەبوو، کەنیزەك و کارەکەرێکی زۆرێش لە ئەندەروونا هەبوون.

ڕۆژێك عەزیزخان چوو بە قینا و گوێی بە دار و دەستەی ئەندەروون نەئەدا، وای لێ هات شەڕ لەناو چاوی ئەباری.

عەزیزخان لەلەیەکی هەبوو «تەیموور»ی ناو بوو. تەیموور وەکوو لەلە بوو، سەروسەکوت و قسەکردنیشی هەموو کۆستکەوتوویەکی ئەهێنایە پێکەنین. ژنانی ئەندەروون پەنایان برد بۆ تەیموور وتیان: ئەگەر ئیمڕۆ تۆ شتێکی وا بکەی عەزیزخان بێنیتە پێکەنین، چیت بوێ ئەتدەینێ.

تەیموور کەوتە شوێن عەزیزخان و لە ناوەڕاستی شەقامی یەکێ لە باخەکانی «بۆکان»دا دۆزییەوە. عەزیزخان کە چاوی بە تەیموور کەوت

ڕووی لێ وەرسووڕاند و ڕووی کردە شەقامێکی‌تر، چونکە ئەیزانی کە تەیموور ئەیهێنێتە پێکەنین و ڕێسی ئەو ڕۆژەی ئەکا بە خوری. تەیموور چوو لە شەقامەکەی‌تریشا لە بەر لووتیەوە سەوز بوو. عەزیزخان چاوی خۆی داخست و لەوێش لای دا. بە کورتی ئەو بۆ هەر لایەك ئەچوو، ئەم وەکوو مووی لووت لە بەردەمیا بوو.

ناچار عەزیزخان لە قەراخ جۆگەیەکدا ڕاوەستا و بە دار دەستەکەی خاکی قەراخ جۆگەکەی هەڵئەدایەوە، ئەمەشی بۆ ئەوە ئەکرد کە خۆی خەریك بکا و گوێ بە تەیموور نەدا. لە ئاخرا تەیموور هەر وازی نەهێنا و تووشی بوو و پێی وت: قوربان، ئەوە لەناو ئەم باخچەدا بەشوێن چیا ئەگەڕێی؟ عەزیزخان بە تووڕەییەوە وتی: سەگباب بەشوێن هینا، بڕۆ وازم لێ بێنە. تەیموور وتی: نا قوربان، ئەبێ بزانم بەشوێن چییا ئەگەڕێی؟. وتی: بەدفەساڵ، پەنجا ساڵە گیرم خواردووە، نازانی؟ تۆ ئیشت چییە بە کاری منەوە؟ وتی: قوربان نابێ، هەر ئەبێ بیڵێیت کە بەشوێن چییا ئەگەڕێیت؟ عەزیزخان ئەمجارە زۆر تووڕە بوو، بە ئەوپەڕی تووڕەیی و دەنگ بەرزییەوە وتی: «قوڕمساغ! بەشوێن کێرا ئەگەڕێم، ئیتر قسەیەکت ماوە؟»

تەیموور وتی: «قوربان! هەرا مەکە و لەسەرخۆت بیڵێ. بە گۆڕی بەگزادەکانی موکری سوێندت ئەدەم کە لەسەرخۆت قسە بکە؛ چونکە ئەگەر ژنەکانی حەرەمسەرا بزانن لەم باخەدا شتی وا هەیە، خاك و بەرد و داری بە توورەکە ئەبێژن و ئەیبەن!».

عەزیزخان دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: ئەی بەڵام لە چارەت دا بۆ خۆت و بۆ قسەت!.

٤. لەو وڵاتی «قوروە»یە دوو ماڵ لە حەوشەیەکا بوون (ئەویش هەر لەسەر کوردەواری ئەژمێردرێ) لە کوردەواریدا بەتایبەتی لە لادێکانا، هیچی تێدا نییە ئەگەر چەند ماڵ لە حەوشەیەکا بن. لە یەکێ لەم ماڵانەدا ژنێکی مێردداری جوانکەلە هەبوو، لە ماڵەکەیتریشا کوڕێکی گەنجی لاوچاك. ئەم کوڕ و ژنە سەروسەودای دۆستایەتی و دەستبازییان پێکەوە دامەزراندبوو، بەڵام هەرچەندیان ئەکرد بۆ ئیشی خێر نەیانئەتوانی بە یەك بگەن و کوڵوکۆی دەروونیان تۆزێ دامرکێتەوە.

ڕۆژێك ژنەکە بە کوڕەکەی وت: بەم جۆرە ئێمە ناتوانین بە یەك بگەین؛ چونکە بە ڕۆژ کە مێردەکەم لە ماڵ نییە، تۆیش لە ماڵ نیت، بە شەو کە تۆ لە ماڵیت ئەویش لە ماڵە؛ کەواتە چار نییە، شەو، کاتێ کە مێردەکەم نوستووە تۆ بێیت و ئیشی خۆت جێبەجێ کەیت. ئەمە لە هەموو چاکترە. ئەوەش بزانە کە مێردەکەم خەوێکی زۆر گرانی هەیە، بەڵام بۆ ئەوە کە لەبەر ئەوە دنیا تاریکە، منت لەگەڵ مێردەکەما لێ تێك نەچێ، من سەری دەزوویەك ئەبەستم بە پەنجەی پێی خۆمەوە، سەرەکەیتر تۆ لە ژوورەکەی لای خۆتان کە بە تەنیشت ژوورەکەی ئێمەوەیە، بیگری بە دەستتەوە بە شارەزایی دەزووەکە شەوێ ئەتوانی بێتە سەرم.

لەسەر ئەم پەیمانە خانم دەزووی بەست بە پەنجەی پێی خۆیەوە و سەرەکەیتری خستە مستی کوڕەی دۆستیەوە. ژنە لە کاتێکا کە لەگەڵ مێردەکەیا نوستبوو، پێی مێردەکەی گیری کرد لە دەزووەکە، پرسی: ئەمە چییە؟ ژنە هەروا بە سادەیی و ساردییەوە وتی: «پیاوەکە، ئەڵێن: هەرکەسە چل ڕۆژ بەر دەرکی ماڵەکەیان بڕشێنێ و گسکی لێ بدا، لە شەوی چلەمیندا خدری زیندە - ڕۆحم بە قوربانی بێ - دێتە خەوی. ئەو کەسەش ئەبێ دەزووەکی سپی ببەستێ بە پێی خۆیەوە، چونکە

دەزووی سپی گزنگی فریشتەیە. ئێستە منیش ئەمە چل ڕۆژە ئەوەم کردووە و ئەمشەو شەوی چلەیە. بێگومان حەزرەتی خدر دێتە خەوم و نیازی خۆمی لێ داوا ئەکەم. ئەم دەزووەش گزنگی فریشتەیە. توخوا مێردەکە بنوو با هیچ دەنگ و سنگێك نەیەت، نەوەك حەزرەتی خدرم لێ بڕەوێتەوە.

مێردەکەی سەرەتا بەم قسەیە پێکەنینی هات، بەڵام پاش ئەوە کە ژنەکەی خەوی لێکەوت، بوو بە گرێ لە دڵیا. بە هێواشی هێنای سەری دەزووەکەی لە پەنجەی پێی ژنەکەی کردەوە و بەستی بە پەنجەی پێی خۆیەوە و لە دڵی خۆیا وتی: لێگەڕێ ژنەکەم عەزیەتی کێشاوە با خێروبێرەکەی من وەری‌بگرم. من و ئەو خۆ هەر یەك ماڵین، هەر خێرێکم لە خدری زیندەوە دەست کەوت، دیارە ژنەکەشم تیا هاوبەشە. لەبەر ئەوەش کە دنیا هاوین و گەرم بوو، ئەویش وەکوو ژنەکەی تەنگەی خۆی لێ کردەوە و بە ڕووتی لێی نوست.

ئەمجا لەولاوە کوڕەی خانم‌باز ـ کە ئاگری بە یەك گەیشتن لەگەڵ دۆستیا هەڵی‌گرتبوو ـ ئەو شەوە هیچ خەو نەچووە چاوی. دەقێقەیەکی بە ساڵێ لێ ئەڕۆیشت. کە کەوتە پاش نیوەشەو بە هێواشی هەستا، بە دڵەکوتێ و دڵەتەپێ بە هەرجۆر بوو، خۆی گەیاندە ئۆدەی ژنەکە. بە شارەزایی دەزووەکە، هات تا گەیشتە سەر پێی کابرای مێرد. دنیاش تاریکە نازانێ، لای وایە ئەمە پێی ژنەکەیە؛ چونکە پەیمان وا بووە. کابراش لە پەوڕوو کەوتبوو، کوڕە ویستی خەبەری کاتەوە بۆ ئەوە ئیش و کار لە شوێنی ڕەسمی خۆیەوە بڕوا، بەڵام لە ترسا کە ئەم خەبەر کاتەوە مێردەکەشی خەبەری بێتەوە بە ناچاری هەر لە دواوەوە پەڕییە کۆڵ کابرای ئەو بە ژن زانیوەوە و لێی توند کرد. کە ئەم لێی توند کرد، کابرا خەبەری بووەوە

و بە دەنگێکی بەرزی بە ترس وتی: «یا حەزرەتی عەباس! یا حەزرەتی عەباس!»

کوڕی بەدبەخت کە لە یەکەم شەوا بووکی بە نێر بۆ دەرچوو، حەپەسا و ڕاچەنی، هەر ئەوەی پێ کرا دەری هێنا و بەرەو دوا پێی لێ کرد بە پشتا!.

لە هەرا و ناڵەی کابرا ژنەکە بە خەبەر هات و پرسی: مێردەکە چی بوو؟ بۆچی هاوار ئەکەی؟ کابرا لەبەر ژانی دوای، دەنگی خاو بووبووەوە، بە نووزەیەکەوە وتی: «هیچ، هیچ، ئەگەر حەزرەتی عەباس نەگەیشتایەتە فریام، خدری زیندە ـ ڕۆحم بە قوربانی بێ ـ هەموو دەوروبەری کۆممی پارچە پارچە ئەکردەوە».

٥. کابرایەك لەو دەشتە لەسەر پێشاو دانیشتبوو. دەوروبەرەکە ڕەز بوو. «شەنگەسوورە»یەك هات و دای بە دەعباکەیەوە. تا هاتەوە بۆ ماڵەوە دەعبا بوو بە قەد کوندەیەك. پیشانی ژنەکەی دا، ژنە وتی: ئەمەت لە کوێ هێناوە؟ کابرا لە دڵی خۆیا وتی: ئاش لە خەیاڵێك و ئاشەوان لە خەیاڵێك. وتی: بەخوا ژنەکە ئەوی ڕاستی بێ هێنەکەی خۆم و دە لیرەم باقی داوەتەوە ئەمەم لە کابرایەك وەرگرتووە. بەڵام ئێستە پەشیمانم؛ چونکە بە دە لیرەکەم هەزار کاسپیم پێوە ئەکرد. ژنە وتی: هیچ پەشیمان مەبە، ئەگەر لە هەموو عومری خۆتا موعامەلەیەك باشت کردبێ، هەر ئەم موعامەلەیە بووە. منیش هەر ئێستە دە لیرەکەت ئەدەمەوە. هەر خێرا هەستا چوو ئەم چەند ساڵە چ پارەیەکی بە پوولە پوولە لە مێردەکەی دزی بوو، هێنای. کە سەیری کرد لە باتی دە لیرە، پانزە لیرەشە، کردیە دەستی مێردەکەیەوە و وتی: ئەوا لیرەیەکیشی زیادە بۆ تۆ باشە، ئیشێکی پێوە ئەکەی. لە پاش سێ چوار ڕۆژ کابرا وانێکەکەی چاك بووەوە و ئاوساوییەکەی

نەما و وەکوو خۆی لـێ هاتەوە. ژنەکە بـە تووڕەییێکەوە وتـی: ئەوە ئەو دەعباکەی کڕیبووت چی لێ هات؟ کابرا وتی: ژنەکە دەنگ مەکە، ئەمە خۆ بە ماڵی دزیـەتی دەرچوو، خاوەنی بۆ پەیدا بووەوە و لێیان وەرگرتمەوە. ژنەکە وتی: «کەواتە بڵێ ئەمە ماڵی دزیـەتی بوو کەوا بەو هەرزانییە کەوتبوە دەست؛ ئەگینا ئیمڕۆ ئەو جۆرە شتە بەنرخانە چۆن ئەدەن بە ئەوەندە پارە. بزانە ئەگەر جارێکی کە شتی وات دەست کەوت نەیەڵی خاوەنەکەی پێی بزانێتەوە!».

٦. ئاخوونێك لە «سونگر» ڕەوزەی ئەخوێند، لە ناوەندی ڕەوزەکەدا وتی: «حەزرەتی ئەمیر فەرموویـەتی: هەرکەسێ بەچەبازی بکا، ئاوی کەوسەر لە دەستی من ناخواتەوە». کابرایەك کە لە بەردەمیا دانیشتبوو بە دڵ گوێی بۆ ڕەوزەکەی شل کردبوو، هەر هەڵسا و پێی وت: «قوربان! لـە زمانـی منـەوە سـەلام بکـە لە حەزرەتـی ئەمیر و عەرزی بکـە: ئەگەر مەسەلە وایە ئاوی حەوزی کەوسەر خۆتان و هەر یانزە ڕۆڵەکەتان، تێ‌کەن و بیخۆنەوە!»).

٧. شەڕی دووەمی گێتی بوو؛ هەم هەموو شتومەکێك گران بوو، هەم لەشکری حوکوومەتەکان بە هەموو لایەکا بڵاو بووبوونەوە. هەندێ سەربازی «پۆڵۆن»ـی بەهۆی گەرمەی شەڕەوە کەوتبوونە کەرکووك. زابتێکی پۆڵۆنی لەگەڵ ئافرەتێکی گەڕیـدەی شەڕا ڕێ ئەکەوێ. قسەیان لەسـەر ئەوە ئەبڕێتەوە کە کابرا جارێك بە خزمەتی ئافرەتەکە بگا و دە دینـاری بداتـێ، بـەڵام بـە مەرجێـك کـە پێنـج دینـاری پێشـەکی بـێ و پێنجەکەی‌تری دوای تەواو کردنی کڵاوەکە. لەسەر ئەم بڕیارە کابرا پێنج دینارە پێشەکییەکەی دا و خرایە جەحەنەمەوە!. بەڵام کابرا لە پاش ئەوە

کە لە ئیشی خۆی بووەوە، دەستی کرد بە ملپێچی کردن لە دانی پێنج دینارەکەی‌تر؛ بە کورتی: نەیدا.

مەلا سدیقی نازەنینی حاکم بوو لە کەرکووك. ئافرەتەکە ئەچێ شکات ئەکا و بەم جۆرە سکاڵانامەیەك ئەنووسێ: «سەرۆکی دادگای بەڕێز! جەنابی «مسیوپلوتارك» ژوورێکی لەم کارەکەرەی خۆت گرتووە بە دە دینار کە پێنج دیناری لە پێش ئەوەدا بێتە ناو ژوورەکەوە بیدات و پێنج دیناریشی پاش ئەوە کە ژوورەکەی وەرگرت. جەنابی مسیو لە پاش ئەوە کە پێنج دیناری پێشەکییەکەی دا، ژوورە ملّکە تایبەتییەکەمی وەرگرت؛ بەڵام بە پێچەوانەی پەیمانی بەینمان، لە دانی پێنج دینارەکەی‌تر ڕوو وەرئەگێڕێ.

لەبەر ئەمە ئەم کارەکەرەی خۆت تکا ئەکا کە بۆ وەرگرتنی پێنج دینارەکەی‌تر لە جەنابی مسیو، ئەوی شایانی داد و عەدڵە بەجێی بێنن، بۆ ئەوە ئەم دوعاگووە داوێن پاکە دڵسووتاوە، هەتا زەمانێکی دێرینە منەتباری ئێوە و دادگاتان بێت. کارەکەرتان: ج».

مەلا سدیق لە پاش ئەوە ئاگاداری پەیدا کرد، بە سەر مەسەلە و سکاڵانامەدا، بە فەرمانێك مسیوپلوتارکی بانگ کرد بۆ دادگا، بۆ ئەوە چی لەم ڕووەوە ئەزانێ خۆی پێی بپەڕێنێتەوە. مسیوپلوتارك لە ڕۆژی تایبەتیدا هاتە دادگا و وتی: جەنابی دادپرس! من بە دوو بەڵگە پێتان ئەسەلمێنم کە ژووری ئەم خاتوونەم وەرنەگرتووە. خاتوونیش لەولاوە ڕاوەستاو بوو. هەر داوایەك کە لەم ڕووەوە ئەیکا من ئەیگێڕمەوە و ناچمە ژێری. دوو بەڵگەکەش یەکێکیان ئەوەیە: کە ئەم ژوورە لە تەنیشت ئاودەستخانەوە بوو، دووەمیان ئەوەیە کە شێی هەڵهێنابوو ستاری تیا نەئەکرا. بەم بۆنەوە تکا ئەکەم داواکەی بگێڕنەوە.

مەلا سدیق زەردەخەنەیەك گرتی و وتی: «جەنابی پولوتارك بەڵگەكانت لەوانە نین كە داواكەیان پێ بگێڕێتەوە؛ چونكە ئەمە ئاشكرایە كە ئێستە زەمانی جەنگە و كرێ ژوور زۆر گرانە. دە دینار شتێكی وا نییە كە پیاو بتوانێ ژوورێكی نایابی پێ بە كرێ بگرێ. دیارە مەگەر هەر ژوورێك بێ بە دە دینار، كە لە تەنیشت ئاودەستخانەوە بێت. دووەم ئەم ژوورە كە تۆ گرتووتە، شێدار و مەرتووب نەبووە، ئەمەش بەوەدا ئەزانرێ كە جەنابتان هەر لەگەڵ چوونە ناویەوە هەموو كەلێن و قوشبنێكتان ئاوپاشی كرد و ڕشاندتان. بێگومان ژوورێك كە شێدار بێت ناشێنرێت. سێیەم ئێوە هەموو ژوورەكەتان گرتۆتە دەست؛ چونكە هەر شتێكتان هەبووە و نەبووە خستووتانەتە ناوی، تەنانەت بەهۆی ئەوەوە كە هەموو ژوورەكەتان داگرتووە و پڕتان كردۆتەوە، دوو باڵتان پێ بووە جێیان نەبووەتەوە لە بەردەرگاكەدا بەجێتان هێشتووە». لە ئاخرا دادگا حوكمی دا بەسەر پلوتاركا بە پێنج دینارەكەیتر و خاتوو «ج» بە سەركەوتوویی لە دادگا چووە دەرەوە!.

٨. حەمەی كوێخاخدری «داربەڕوولە» هەبوو؛ لە زەمانی توركەكانا عەسكەر بوو. ئەم حەمەیە بەدەم عەسكەرییەكەوە كاسبییەكیشی بۆ خۆی دۆزیبووەوە كە پێی بژیت. كاسبییەكەش ئەوەبوو «گرەو»ی لەگەڵ خەڵك ئەكرد لەسەر پارە، زۆرتر وەخت گرەوەكەی ئەبردەوە و پارەكەی وەرئەگرت. لەم ڕێگایەوە بۆ خۆی پارەیەكی باشی پێكەوە نابوو. بەڵام هەموو سەربازی فەوجەكەی خستبووە سەر ساجی عەلی.

فەرماندەی فەوجەكەی «یووزباشی»ـیەك بوو. ئەم یووزباشییە بە تەواوی بە تەنگ هاتبوو بە دەستیەوە. بە لێدان، بە حەپس كردن، بە

هیچ شتێك چاری نەئەکرد. ئاخری دێتە سەر ئەوەکە لە فەوجەکەی خۆیا نەیهێڵێت و بینێرێتە لای یەکێ‌تر. بەم بۆنەوە ئەنووسێ بۆ «بین‌باشی» کە ئەم کابرایە لەلای ئەو نەیەڵێ. بۆی ئەنووسێ: «سەربازێکمان لایە هیچ ئیش و کاری نییە گرەو کردن نەبێ و هەموو سەربازەکانمانی لات کردووە. هەرچەندە لێی ئەدەم و حەپسی ئەکەم، واز نایەنێ وە زۆرتریش لە گرەوەکانیا هەر ئەیباتەوە؛ تەنانەت تا ئێستە دوو سێ جاریش لەگەڵ من کردوویەتی و لێ بردوومەتەوە. وام لێ هاتووە هیچ پارەی بە دەستەوە نەهێشتووم. تکا ئەکەم لەلای ئێمە هەڵیگرن و بیخەنە شوێنێکی‌کە».

ئەم نووسراوە ئەنێرێ بۆ بین‌باشی. بین‌باشی کە ئەیخوێنێتەوە لەمە توورە ئەبێ و بە تەلەفۆن بە یوزباشییەکە ئەڵێ: هەر ئێستە ئەو کابرایە بنێرە بۆ لام و با لای خۆم بێت، دیارە ئێوە ناتوانن تەمێی بکەن؛ وەیا ناتوانن لەشکر بەخێو کەن؛ ئەگینا چۆن شتی وا ئەبێ؟ ئەبێ تا ئێستە ئەو کابرایە گوێی لە شریخەی شەلاخ نەبووبێ.

لەسەر ئەم فەرمانە حەمەی‌کوێخاخدر ئەنێرێ بۆ لەشکری بین‌باشی و ئەچێ لە بەردەم فەرماندەدا تەق، سەلامێکی سەربازی دائەکوتێ و ئەڵێ: قوربان من سەربازی لەشکری یەکەم حەمەی کوێخا خدرم.

فەرماندە ئەڵێ: سەگباب بۆچ لە لەشکری یەکەمدا گرەوت ئەکرد و ئەتبردەوە؟ ئەڵێ: قوربان من چی بکەم، ئەوان گرەویان لەگەڵ ئەکردم و منیش ئەمبردەوە. بەختم هەبوو لە گرەودا.

فەرماندە ئەڵێ: گووت خوارد، بەختم هەبوو چییە؟ ئێستە تەشریفت بڕوا تا ئەگەمە خزمەتت.

حەمەی کوێخاخدر لەو کاتەدا کە ویستی سەلام بگرێ و بگەڕێتەوە دواوە، کوتوپڕ بە فەرماندەی وت: قوربان وا تێ ئەگەم جەنابتان

«مایەسیری»ـتان هەیە.

بین‌باشی وتی: سەگباب! گوو مەخۆ. ئەم فڵتە فڵتە چییە؟ من لە ژێر چاوێر پزیشکی تایبەتی دام؛ هیچ دەردێکم نییە، نە مایەسیریم هەیە نە شتێکی‌تر.

حەمە وتی: قوربان من گرەوت لەگەڵ ئەکەم کە ئێوە مایەسیریتان هەیە، بە ڕەنگتانا دیارە. فەرماندە وتی: سەگباب! دیسان دەستت دایەوە بە گرەو کردنەوە؟

حەمە وتی: بەڵێ قوربان گرەو ئەکەم، گرەو ئەکەم لەسەر پەنجا لیرە کە جەنابتان مایەسیریتان هەیە.

فەرماندە زۆر تووڕە بوو هەر قسەکەی حەمەی ئەگێڕایەوە: پەنجا لیرە، گرەو ئەکەم لەسەر پەنجا لیرە... گرەوم لەگەڵ ئەکا لەسەر پەنجا لیرە! تەواو... تەواو.

لە پاشا لە دڵی خۆیا فیکری کردەوە وتی: خۆ من مایەسیریم نییە، ئەگەر بێت و گرەویشی لەگەڵ نەکەم لە چەند لاوە خراپە ڕووم تێ‌ئەکا: یەکێ ئەم سەربازە ئەگەر گرەوی لەگەڵ نەکەم لەناو لەشکرەکەدا بڵاوی ئەکاتەوە کە من مایەسیریم هەیە؛ یەکێ پەنجا لیرە گاڵتەی لەگەڵ کرێ مانگانەی دوو مانگمە. من کە ئەزانم مایەسیریم نییە بۆچ ئەم گرەوە نەکەم؟ یەکێکی‌تر ئەوەیە کە لە هەموو زیاترە کە من ئەم سەگبابە گرەوی لەگەڵ بکەم و لێی بەرمەوە و بە یووزباشی فەرماندەی لەشکری یەکەم بسەلمێنم کە ئەم سەربازە گوویەکی وا نییە. ئەو سەربازەی کە لە لەشکرەکەی ئەوا پاڵەوان بوو، هەر کە هاتە لەشکرەکەی منەوە، من خۆم لێم بردەوە.

بین‌باشی کە ئەم شتانەی هەموو لێك دایەوە و سەیری کرد هەمووی

قازانجی خۆیەتی، بە سەربازەکەی وت: بچۆ پزیشك بێنە تا تەماشام بکا، من ئامادەم بۆ ئەوە ئەم گرەوە بکەم. حەمەی‌کوێخاخدر وتی: قوربان! پزیشکی ناوێ، مایەسیری دوو جۆرە، یەکێ تەڕە و خوێنی هەیە، یەکێ وشکە و دوگمەی هەیە. من خۆم چاکی لێ ئەزانم، فەرموو دەرپێکەت داکەنە! خۆم تەماشاتان ئەکەم؛ چونکە دەستی حەکیمیم هەیە.

بین‌باشی حەمەی کوێخاخدری بردە ژووری تایبەتی خۆیەوە و دەرپێکەی بۆ داکەند. حەمە پەنجەی خۆی تا بن کرد بە قنگی فەرماندەدا و دەری‌هێنایەوە و وتی: قوربان هەرچەند سەیرم کرد ئێوە بە هیچ جۆر مایەسیریتان نییە، گرەوەکەم دۆڕان، فەرموو ئەمە پەنجا لیرەکە. خێرا دەستی برد پەنجا لیرەکەی لە بەردەم فەرماندەدا دانا.

بین‌باشی بە خۆشی خۆشی دەرپێکەی هەڵکێشایەوە و پەنجا لیرەکەی خستە تەنکەی باخەڵی و هاتە ژووری ئیدارە و دەستی دایە تەلەفۆن و قسەی لەگەڵ یووزباشی فەرماندەی لەشکری یەکەم کرد و وتی: هەی بێ‌مێشك بەڕاستی ڕاستە کە هیچ ئیدارەت نییە. ئەم سەربازە خوێڕییە کە ناردبووت لە ماوەی دە دەقیقەدا پەنجا لیرەی بە من دۆڕان و چاوم شکاند کە جارێکی‌کە گرەو لەگەڵ کەسا نەکا.

یووزباشی وتی: چۆن؟ بین‌باشی وتی: پێی وتم: کە تۆ مایەسیریت هەیە و لەسەر پەنجا لیرە گرەومان کرد، وە خۆی بە هەموو ئارەزووی خۆی پەنجەی کرد بە منا. کە سەیری کرد هیچ مایەسیرییەکم نییە، جوان و پوخت پەنجا لیرەکەی دانا و ئاقڵ بوو! بۆ جارێکی‌کەش کە ئیتر گرەو نەکات.

لەم کاتەدا یووزباشی فەرماندەی لەشکری یەکەم لە پشت تەلەفۆنەکەوە بە حەپەساوییێکەوە وتی: ئاخ، پشتم شکا! بین‌باشی وتی: چی بوو؟

یووزباشی فەرماندەی لەشکری یەکەم وتی: ئەم سەگبابە چەندە فێڵباز و دەستتەڕە. لەگەڵ منا لەسەر دووسەد لیرە گرەوی کردووە کە من ئەو بنێرم بۆ لەشکری ئێوە بە گەیشتنە پێشەوەی پەنجەیەك بکا بە قنگی فەرماندەدا کە جەنابتانن. من وتم: کە ناتوانی، ئەو وتی: تۆ گرەوم لەگەڵ بکە و بمنێرە، ئەگەر بینباشیم بە پەنجەیەك تاقی نەکردەوە، تۆ دووسەد لیرەی خۆت وەربگرە. ئەوا ئێستە وا دیارە دەستی خۆی وەشاندووە و پەنجەی کردووە بە قنگی جەنابتانا، دوو سەد لیرەکەی لە من بردۆتەوە، پەنجا لیرەی داوە بە جەنابتان و خۆیشی سەدوپەنجا لیرەی ماوەتەوە. بینباشی دەستی سارد بووەوە، تەلەفۆنەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە!.

٩. ئەو ساڵە قائیمقامێك لە چوارتا هەبوو، کە یەکەم جار بوو چوارتا قائیمقامی تێئەچوو، وە یەکەم جاریش بوو ئەو کابرایە ئەبوو بە قائیمقام. مودیری ماڵ «میرزامارف» بووە.

ڕۆژێـك لـە ئاخری مانگا لیستەی ئەو مانگەی دایەرە، بەم جۆرەی خوارەوە ئەنووسێ و ئەیبا بۆ قائیمقام ئیمزای بکا و بینێرن بۆ سولەیمانی:

لەوازمی نووسین ٢٠٠ ڕووپیە. سووتەمەنی ١٠٠ ڕووپیە. تەعمیرات ١٠٠٠ ڕووپیە. مەعاشی ئەهلی دایەرە ٢٠٠٠ ڕووپیە. جەمعی کول ٣٣٠٠ ڕووپیە.

قائیمقام سەیرێکیان ئەکا و ئەڵێ: لەوازمی نووسین تەواوە: ٢٠٠ ڕووپیە، سووتەمەنی تەواوە: ١٠٠ ڕووپیە. تەعمیرات تەواوە: ١٠٠٠ ڕووپیە. مەعاشی ئەهلی دایەرە تەواوە: ٢٠٠٠ ڕووپیە. ئەمجا چاوی ئەکەوێ بە جەمعی کول: ( ٣٣٠٠ ڕووپیە ) تووڕە ئەبێ و ئاگری تێبەر ئەبێ ئەڵێ: ئەم جەمعی کولە سەگبابە کێیە کە هەر مانگێك ئەوەندە

پارە لەم دایەرەیە وەرئەگریٚ؟ وە من تا ئیٚستە ڕیٚ نەکەوتووە جاریٚك بەرچاوم بکەویٚ؟

ئەمجا کاتبی تەحریر بانگ ئەکا و ئەڵیٚ: «لە ئیٚستە زووتر نییە ئەم «جمع کُل»ـە سەگبابە فنش کەو ئیٚتر پوولیٚکیتری مەدەنیٚ، وەرەقەی فنشەکەیم بۆ بیٚنە ئیمزای کەم».

١٠. ژنیٚکی ڕوغزایی هەبوو «میمکە ئەفرۆز»ی ناو بوو. ساڵیٚك لە گەرمیان گلیان خواردبووەوە و نەچووبوون بۆ کویٚستان. سەگیٚکیان هەبوو هاتبووە «با». میمکە ئەفرۆز ئەچوو بە لایەوە ئەیوت: «ها سەبۆر گیان، نەدەی وە سەگی گۆرانی کوڵەجۆ، تاك تاکیٚك بدە وە سەگەکەی حەمەجان قەیناکا لە خۆمانە!».

١١. شیٚخ فەتاح لە ڕەمەزانا مەلای خیٚڵی حەمەسەنی تەرخانی بوو. مەلا کاکەحەمەش هەر لەو ڕەمەزانەدا مەلای خیٚڵی ڕۆستەمی ئەحمەد بوو. شیٚخ فەتاح بۆ بانگ و سەڵا دەنگیٚکی خۆشی هەبوو، بە پیٚچەوانەی ئەو، مەلا کاکەحەمە دەنگی زۆر ناخۆش بوو. دەنگی شیٚخ فەتاح ئەچووە خیٚڵی ڕۆستەم و هەموویان گوییان لیٚ ئەبوو. پیریٚژنیٚکی خیٚڵی ڕۆستەم کوتوپڕ کە مەلا کاکەحەمە ئەبینیٚ و سەڵا ئەکا، ڕوو ئەکاتە چەند پیاویٚك کە دانیشتبوون ئەڵیٚ: «مەلا، مەلای خیٚڵی حەمەسەنە؛ دەنگی وەك نیٚرەکەر تیٚت. مەلاکەی ئیٚمە ئیٚژی سەگەنازی گزنگە هەر قرخە قرخیەتی. وە کەلامی خوا ئەویٚ سەرفترە بدەین وەو».

شەوی دوایی شیٚخ فەتاح -کە ناوی خۆی بیستبووەوە- چاکتر تیٚی چریکان بۆ سەڵا کردن. مەلا کاکەحەمەش لەو کاتەدا ئەویش

سەلای ئەکرد، پیرێژنێکی‌تر کە گوێی لە دەنگی هەردووکیان بوو، چووە بەر لووتی مەلا کاکەحەمە و پێ وت: «بیورەوە، بیورەوە مەلا، هەی کێری مەلاکەی خێڵی حەمەسەن وە قنگم بۆ مەلام! بیورەوە بێ‌فەڕ. هەر قرخە قرختەس، وە کەلام خوا ئەوێ سەرفترە بدەین وەو!».

١٢. هەر ئەم شێخ فەتاحە لەگەڵ «شێخ کاکەحەمەی ناوە» ئەچن بۆ ناو جاف بۆ دەروێش گرتن. ئەگەنە قەراخ خێڵێك و دێن بە پیریانەوە. پیرێژنێك حاڵی لێ هات و ڕووی کردە شێخ و ئەیوت: «هۆ! وە قوروانت وم شێخە چاو حیزەکە هۆ!».

١٣. خێڵ ئەگەڕانەوە بۆ گەرمیان لە «تاریەر» ژنێك «گا»کەی ئەگلێ و ئەڕوا. ژنە هاوار ئەکاتە غەوس، هیچ کەڵکی نابێ. پاشان بانگ ئەکاتە شێخ کەریمی کەسنەزان، لەو کاتەدا کوتوپڕ گا گیر ئەکا لە پنچکێك و ئەگیرسێتەوە. ئەمجا ژنە ئەیوت: «های وە قوروانت وم کەریمە سووری کەسنەزان! کلکی گرت و تڕی بڕی!».

١٤. خێڵ سەرەوژوور ئەبووەوە بۆ کوێستان. کابرایەکی «باشکی» دانی سۆڵەسۆڵی ئەکرد وتی: تا دەستم لە گەرمیان نەبڕیاگە با بیکێشم. چووە «کفری» و چووە لای کابرایەکی ناڵبەند وتی: ئا برا ئەو دگانەم بۆ بکێشە. کابراش پەتێکی هێنا سەرێکی بەست بە ددانی کابراوە و سەرەکەی‌تری بەست بە کۆڵەکەی دووکانەکەیەوە، ئەمجا چوو بزێکی کرد بە کابراوە. کابرا تەکانێکی دا هەڵبێت، دانەکەی بە پەتەکەوە مایەوە. ئەمجا دوور کەوتبووەوە ئەیوت: «سەیرکە دەویت باوکە ئێژی سەری دگانەکە لە دەممایە و ڕیشەکەی لە قنگمایە وا بزم پێوە ئەکا!».

١٥. مەلا سەعیدی هەورامی وتی: لە گەرمیان لە خێڵێکی باشکی مەلای ڕەمەزان و لە ماڵی «حەمەلاو»ی باشکی بووم. حەمەلاو دوو ژنی هەبوو، گەورەکەیان «ئامە»ی ناو بوو. ئەو ڕەمەزانە حەمەلاو هیچی پێ نەکرابوو، کەوتە دەمەدەمی جەژن لە ڕۆژی عەرەفەدا ئامە گۆیا ئەچێتەوە بۆ ماڵی باوکی بۆ ئەوە جەژن لەوێ بکا، حەمەلاو بە هەلی ئەزانێ ئەچێ بەرۆکی ژنە بچکۆلەی ئەگرێ و ئەڵێ: کچێ ئامە لێرە نییە با خەریك بین. مەلایش خۆمانەیە! تا ئامە لێرە نییە دەستێ ئەوەشێنین.

کە حەمەلاو و ژنەکەی خەریکی ئیش ئەبن، ئامە لە پێشا دڵی چەکەرەی کردبوو، خۆی لێیان داگرتبوو، لەو کاتەدا ئەچێ بە سەریانا. حەمەلاو هەر خێرا جامانەکەی ڕائەخات و دەست ئەکا بە نوێژ کردن. ئامە ئەچێ بە جنێودان تێی بەر ئەبێ و ئەچێ چاکی کەواکەی هەڵئەداتەوە، سەیر ئەکا حەیتە مل دابڕیاگەی جارانی خۆی لە ژێر کەواکەوە بەلەبەلیەتی. ئەڵێ: «حەمەلاو، درۆزن ڕووی باوکی ڕەش وێ، ئەمە کێری تەحیات و نوێژ کردنە؟ توخوا مەلا، تۆ پیاوێکی وە تەحیاتی، بۆ خوا قسە بکە ئا ئەم کێرە کێری تەحیاتە؟».مەلا سەعید وتی: ناچار منیش دامە پاڵی وتم: «نەوەڵڵا کێری تەحیات وا بەلەبەلکەر نییە».

١٦. «ساڵح کچانی» هەبوو لە کفری باوکی ئەم حاجی شاسواری کچانیە؛ بازرگان بوو. ڕۆژێك کابرایەکی جاف ـکە ناسراوی ساڵح ئەبێ ـ ئەچێتە ئەوێ و ئەویش میوانی ئەکا و ئەیباتە ماڵەوە. کابرای جافە گایەکی پێ ئەبێ، لە بەیانییا گاکە لە بازاڕ ئەفرۆشێ و ساڵح ئەکا بە دەستەبەر کە ئەم گایە دزیەتی نییە. پارەی خۆی وەرئەگرێ و ئەگەڕێتەوە و خێڵ ئەچێ بۆ کوێستان. لەم لاوە گا بە دزیەتی دەرئەچێ،

جوان و پوخت لالۆ ساڵح ئەگرن پارەی گاکەی لێ ئەسێننەوە.

خێڵ لە کوێستان ئەگەڕێتەوە و کابرا هەمانەیەك «کەشك» هەڵئەگرێ دێت بۆ کفری. هەمانە کەشك ئەفرۆشێت و بۆ ئێوارە دێتەوە بۆ لای لالۆ ساڵح، وەکوو نە بای دیبێ و نە بۆران. لالۆ ساڵحیش هیچ نایخاتە ڕووی، هەروەکوو جاران قسەی خۆشی لەگەڵ ئەکا و ئەیباتەوە بۆ ماڵەوە.

دنیا پاییزە، لالۆ ساڵح ئەڵێ نیسکێنەیەکی سوێری گۆرانانە لە ماڵەوە دروست ئەکەن. شەوی دوو قەرەوانەی چاك نیسکێنە دائەنێن، کابرا هەتا لە لووتی دێتەوە نیسکێنە ئەخوا و پاشان خۆی بە تەنها لە ژوورێکا ئەنوێ و دەرگای دەرەوەی ژوورەکەی لەسەر دائەخرێ. ئەکەوێتە نیوەشەو کابرا حەلوەلای پێ ئەکەوێ، هەڵئەستێ دەست ئەنێ بە دەرگاکەوە، سەیر ئەکا لەودیوەوە داخراوە. هیچ چاری نامێنێ هەمانە خاڵییەکە دێنێ و تێی‌ئەڕوێنێ. بەو جۆرە لە سەری ئەڕوا تا بەیانی پڕی ئەکا و هەر جارەش ئەڵێ: بکەم وە گۆڕ باوکتەوە گۆرانە هیزە».

لەولاشەوە هەر سەرلەئێوارەوە ساڵح بە دوو جامبازی خەڵکی کفری ئەڵێ: میوانێکمان هاتووە هیزەیە ڕۆنی نایابی پێیە. بەیانی جامبازەکان لەگەڵ مەلا بانگدانا ئەکەونە جامبازە و بەر قاپی ماڵی لالۆ ساڵح ئەگرن. کابراش هەر لە تاریك و لێڵەدا هەڵئەستێ لە تەریقیانا هەمانە گوو ئەدا بە کۆڵیا و دێتە دەرەوە. هەر کە دێتە دەرەوە جامبازەکان قیڕ، ئەیگرن.

جامبازی ئەوسای کفریش وەکوو تانجی چۆن ڕاوی نێری دەستکەوتایە بەرەڵای نەئەکرد، ئەمانیش بۆ کورد و کارەی دەرەوە ئاوا بوون. هەمانە ئەگرن و ئەڵێن: ئەم ڕۆنەت بە چەند؟ کابراش ئەڵێ: ڕۆن نییە، لێم گەڕێن. ئەوان تازە نێچیری خۆیان دەستکەوتووە بەرەڵا کردن هەر نییە. هەر ئەڵێن: ئەبێ لێت بسێنین و ئەمیش هەر ئەڵێ: نایفرۆشم. لە ڕوویشی

هەڵنایە بڵێ: گووە. ئەوان هەمانە ڕائەکێشن و ئەم ڕایئەکێشێ و ئەڵێ: بکەم وە قنگ دایکتانەوە بەرەڵای کەن با بڕۆم، بەجێ مام. لەم مرومشت و بگرەوبەردەدا پشکی هەمانە بەر ئەبێ و ـ شەرووت وێ لە ڕووتا ـ گووی لە نیسکێنە دروستبوو، هەموو سەروچاوی جامبازەکان ئەشواتەوە.

دیارە لەم هەرا و هوریایەدا دنیا بە تەواوی ڕووناك ئەبێتەوە و ئەبێ بە ڕۆژ. خەڵکی دائەبارێن. جامباز و کابرای جافە، ئیش لەوە ئەترازێ کە بە شێنەیی لەگەڵ یەك بیزوونەوە. ئەوان ئەم ئەدەنە بەر شەق و پاشماوەی پیسایی لە سکیا مابووەوە هەمووی هەڵئەڕژێتە ئەو ناوە. ئەمیش بە گالۆکەکەی دەستی و بە هەمانەی بن دەستی ئەوەندەی‌تر ئەوان ئەشواتەوە. لالۆ ساڵحیش وەکوو خەڵکی‌تر دێت لەولاوە سەیر ئەکا.

جامبازەکان جنێویان ئەدا بە لالۆ ساڵح بۆ ئەو ڕۆنە چاکەی بۆیانی دۆزیوەتەوە. کابرای کوردەش هەر جنێوی ئەدا بە لالۆ ساڵح بۆ ئەم میوانداریەی کە کردی. ئەوان لەو ناوەدا بەو جۆرە یەکتریان سەگکوژ کرد. کابرای کوردە بە هەرجۆر بوو نیوە گیانێکی دەرکرد و چووەوە؛ ئیتر لە تەرێقییا جارێکی‌کە ڕووی نەکردەوە بە کفرییا. لالۆ ساڵح ڕزگاری بوو لە دەستی.

١٧. کچێکی ئەو عەشیرەتە خەوی دیبوو، بۆ دایکی گێرایەوە وتی: «دایە لە خەوما چتێکی سووری مل داوڕیاگ لەناو گەڵما کەفی ئەچەران». دایکی چەپۆکێکی دا بە سەریا و وتی: «وەی ڕۆڵە باوانت شێوگێ، نەیانگاوێتی؟ ئادەی بێژە» کچە وتی: «دایە ئەوە تۆ بێژی چی؟ گان وا ناوێ، بۆچی تۆ وا ئەزانی من نەمدیگە؟!» وتی: ئادەی بێژە. کچە وتی: «لە هەوارگە خوارگەی کوێستان، گوڵەی کوڕی حەمکی حەمەجان،

لای ڕان وەستابوو، گالۆك لەسەر شان، کەوتە سۆزەوە دنیای ئەسووتان. هات وە لامەوە وەك دزی گۆران، قریوەیەکی کرد و شانی هەڵتەکان، کە نای وە درگای کوسمەوە، قنگم وتی: فیڕفێنگ!».

١٨. ژنێك هەبوو «باجی سەمەن»ـی ناو بوو، تەغاریَ شووی کردبوو. شوویەکی‌تری خستە سەر، بوو بە ٣١. ئەو شەوەی گواستیانەوە بۆ مێردی سی‌ویەکەمین، دەستی کرد بە گریان و نووکەنووك. پێیان وت: ئەم گریان و نووکەنووکەت لە چییە؟ خۆ تۆ وەنەبێ ئەمە یەکەم شووت بێ؟ وتی: «بەڵێ وایە، بەڵام ئەمە بۆ ئەوەیە کە ڕەوشتەکە تێك نەچێت!».

١٩. شاخێك هەیە لەو خۆشناوە شاخی «تف لە دەست»ـی پێ ئەڵێن. گۆیا ڕۆژێك هەندێ لە کوڕوکاڵی خۆشناو ئەچن بۆ ئەوێ و ئەکەونە دەمەتەقێ کە شاخەکە بپێون. هەندێکیان ئەڵێن: بە گوریسان بیپێوین. هەندێکیان ئەڵێن: بە داران بیپێوین. پیاوێکی زۆر دانایان تیا ئەبێ ئەڵێ: وا نابێ بابم. بە زەلامان بیپێوین؛ بۆ ئەوە بزانین چەند باڵا پیاوە. هەموو ئەڵێن: قسە ئەمەیە کە حەمەدێ ئەیکا.

حەمەد ئەچێتە سەر شاخەکە دەست بە لووتکە بەردێکەوە ئەگرێ، خۆی شۆڕ ئەکاتەوە، یەکێکی‌تر ئەچێ دەست بە قاچی ئەوەوە ئەگرێ و ئەویش خۆی شۆڕ ئەکاتەوە، بەو جۆرە حەوت هەشت کەس وا ئەکەن. حەمەدێ لە سەرەوە باڵی وەختە بپچڕێ بانگ ئەکا: «ڕحمەتوو لێ بێ دەستان توند بگرن، تف لە دەستی خۆ دەکەم». ئەمە ئەڵێ و دەستی لە لووتکەی شاخەکە بەرەڵا ئەکا بۆ ئەوە تف لە دەستی خۆ بکا. کە ئەوە ئەکا هەموو زرم! ئەکەونە خوارەوە هەپروون بە هەپروون ئەبن.

٤٠. مەلا «عبدالصمد»ی هەجیجی هەبوو، سەردەمێك فەقێیان ئەچوون لایان ئەخوێند. عیلمی «مَنطِق» لەناو فەقێیانا زۆر باوی پەیدا کرد و کتێبی «گَلَنبَوِی بُرهان» کەوتە برەو. فەقێ ئەوەندە ڕوویان نەئەکردە ئەو بۆ خوێندنی مەنتیق و بۆ ئەو کتێبە ئەچوونە لای «سەیدی چۆڕ» و لای پیاوێ وەکوو ئاغامحەمەد ئەیانخوێند و توخنی مەلا عەبدوسسەمەد نەئەکەوتن.

مەلا عەبدوسسەمەد ئەمەی پێ ناخۆش بوو، ڕۆژێك توورە ئەبێ و ئەڵێ: «تا ئەو وەختە ئێمەمانان هەبووین، مەنتیق و هەموو شتێکی تریشمان ئەوتەوە؛ ئێستە ئەوەتی ئەو «گونمبەوی» و شتە داهاتووە، فەقێگەل بە ئێمە ڕازی نابن!».

٤١. «فرج الله»بەگی بالك عەمری خوائەکا و بە مەلا عەبدوسسەمەدی هەجیجی ئەڵێن: «قوربان پیاوێکی وەکوو فەرەجوڵلابەگ شایانی ئەوەیە کە زاتێکی وەکوو جەنابتان بیشۆن، جا فەرموو بیشۆن». ئەویش ئەڵێ: «موبارەك نەبێ! لە ئێستە بەدواوە هەر کەرێك لەو چەمە بتۆپێ ئەڵێن: فەرموو ئەبێ زاتێکی وەکوو جەنابتان بیشۆن!».

٤٢. کابرایەکی ئەو دەشتی دزەییە «پیوەن»ی وڵاخی لەو دەشتی قەراجە لێ ون بووبوو، ئەچوو بە شوێنیا لەناو عەرەبەکانی قەراجدا ئەگەڕا. تووشی کابرایەکی عەرەب ئەبێ لێی ئەپرسێ و تەزبێحەکەشی ئەگرێ بە دەستەوە و ڕایئەوەشێنێ و ئەڵێ: «یا با! تۆ نەدیتە زڕ ماڵ حێ حێ!». (بە خەیاڵی خۆی ئەمە عەرەبییە).

٤٣. کابرایەکی کورد سەردەمی گەنجێتی بەسەرچووبوو، ئەو سەردەمەی بەسەرچووبوو کە گەلێ گەمەوگاڵتەی بە دەعباکەی

کردبوو، ئەوەنـدە پشتەسـتوور بووبـوو پێـی، لای وابـوو تا ئەو ڕۆژەی ماوە هەر ئەو هەڕەتەی ئەمێنێ. لە پاشا وای لێ هات نەیئەتوانی مێشی پێ دەرکا. بۆ نەگبەتی لەو کاتەشـا ژنێکی هێنا و هیچی پێ نەئەکرا. ئەمجا ڕووی تێکرد و بەم جۆرە دەستی کرد بە گلەیی کردن لەگەڵیا و پێی وت:

تووڵەی تەڕە مار سەرسوورەی بێ خێر
نەعلەت نامــەم بێ پێت نەیێژم کێر
گەزافــت ئــەدا من ســاج ئەســم
خاســت نەســمی دەســتت وە گونم
ملــت شــۆڕ کردگــە وە بانــی گونــا
ڕوو زەردیــت هــاورد وە شــانی منا
ئــەم کارە چی بــوو لەگەڵــت کردم
بێ فەڕەی هێزە بــۆچ حەیات بردم؟
لەناو عەشــرەتا قیتەقیــت کەر بووم
لە سایەی تۆوە ئێســتە وە پەن بووم

٢٤. «ئەحەی کرنوو» پیاوێکـی قسـە نەسـتەق و کردەوە نەسـتەق بوو لە سولەیمانی. شـەوێکی زستان میوانی ئەبێ و ئەکەونە درەنگ. کوتوپڕ لەو شەوەدا دز دێتە سەر ماڵەکەی و لە پشتەوە دیوارەکە ئەکەننەوە، ئەمانیش هەستی پێ ئەکەن. ئەحە ئەڵێ: هیچ دەنگ مەکەن و چرا بکوژێننەوە و خۆتان بکەن بە نوستوو.

دزەش لەولاوە دیوار کون ئەکا و دێتە ژوورەوە، سەیر ئەکا هیچ هەستێك نییە و خێزان هەموو نوستوون. دێت ئەکەوێتە لای ژوورووی ژوورەکە، خێرا لـەو کاتـەدا ئەحـە خۆی پەلامـار ئەدا بـەر کونەکەی لـێ ئەگرێ و

ئەڵێ: چراکە هەڵکەن؛ چرا هەڵئەکەن و دز ئەگرن. کە دز ئەگرن، ئەحەحوکمی لێ ئەکا ئەڵێ: ئەبێ دەست بکەی بە هەڵپەڕکێ. دزە هەرچەندە هاوار ئەکا کەڵکی نابێ، تا کون لە ڕۆژ ئەبێتەوە دزە ئەکەوێتە سووڕدان و هەڵپەڕکێ وەکوو مەیموون. کە ڕۆژ ئەبێتەوە بەرەڵای ئەکا و ئەڕوا.

٢٥. کابرایەك بە ڕیشی سپییەوە خەریك بوو کەرێکی ئەگا. کوڕێکی هەبوو چوو بە سەریا و پێی وت: بابە! تۆ شەرم ناکەی؟ کابراش پێی وت: «کوڕم، ڕووی بێکەسی ڕەش بێ، ئەمە ئیشی تۆیە، بەڵام لەبەر ئەوە بێکەسم و کەسم نییە ئەبێ وا خۆم خەریك بم ئەم ئیشانە بکەم!».

٢٦. پیرێژنێکی بێوەژن خەڵکی ئەو وڵاتی «شیناوێ» و «گوڵاوێ»یە بوو، کوڕ و کچێکی هەبوو، کچەکەی «ئامە»ی ناو بوو کوڕەکەی «مامەند». کەوتبوونە ئەو وڵاتی موکریانە و لەوێ داگیرسابوونەوە. هەرجار کە مامەند ئەچووە دەرەوە و ئەهاتەوە دایکی لێی ئەپرسی: کوڕم دەنگوباس چییە؟ ئەویش ئەیوت: هیچ نییە. پیرێژن بە پرسیار کردن کوڕەی وەڕس کردبوو.

ڕۆژێك کوڕە هاتەوە و دایکی وەکوو جاران لێی پرسی: کوڕم دەنگوباس چییە؟ لەو کاتەشا ژنە بە هەردوو دەست خەریکی هەویر شێلان بوو، ئامەی کچیشی لەولاوە دانیشتبوو. کوڕەش وتی: وەڵا دایە ئیمڕۆ عەزیزخانی سەردار فەرمانی دەرکردووە ژنی بێمێرد نەمێنێتەوە، ئەبێ هەموو مێرد بکەن. بێجگە لەمەش ئەبێ ژنی پیر بدرێ بە کوڕی گەنج و ژنی جوانیش بدرێ بە پیاوی پیر!. کە کوڕە ئەمەی لە دەم هاتە دەرەوە ئامەی خوشکی لەولاوە جرتێکی کەند و وتی: «چۆن وا ئەبێ؟»

ئەمجا دایکەی پیرێژن بە دەم هەویرشێلانەکەوە وتی:

جرت و مرتی پێ ناوێ ئامــەی کچــی گوڵاوێ
ئەتــۆ دەکــەی جرتانێ ئەمــن دەکــەم گەمانێ
تــۆ چاتــری دەزانــی یــا ســەرداری بۆکانی؟
ئەو قسەیەی ئەو کردی ئەیگێڕێتەوە مامەندی
بە ئایــەت و وە قورعان بە چاوەکەی عەزیزخان
بڕیـــــــاری وی دراوە کەس نایگێڕێتەوە دواوە

٢٧. لەو وڵاتی خۆشناوەتییە دوو گوند هەیە یەکێکیان ناوی «کۆڕێ» و ئەوی‌کەیان «ماوەران»ـە. کابرایەکی کۆڕیـی، کیژێکی لە ماوەران خواست. شەوێ کە ئەچێتە لای کیژە و پاڵی پێوە ئەنێ، سەیر ئەکا هیچ نییە و بێ بنە. کابرا ئەڵێ: «هۆپ». کیژە پێ ئەڵێ: «هۆپت بە هۆپێ، چاوی چۆپت لەگەڵی بقۆپێ، لە کوڕە کوڕەی کۆڕێیان، لە بنە تەڕاشەی ئەرماوانێ، چا نییە هەندە شت لۆ مایە!».

٢٨. مەلا شەریف هەبوو لە گوندی «دارەتوو» سوختەیەکی هەبوو؛ ڕۆژێـك پێـی ئەڵێ: مامۆستا چۆن یەکێك عاشق ئەبێ بە یەکێك؟ مەلا شەریفیش پێ ئەڵێ: ئەو کەسە سەیری کەس ناکا تەنها یەکێك نەبێ و ئەیکا بە دۆست و پاشان ئەبێ بە مەعشووقی.

سوختەکە دڵی بە کچێکەوە بوو، پاشان قەوماندیان. ئەمجا مەلا شەریف وتی: «ئەی فەقێیەکەی دارەتووی، هەی ڕووت ڕەش بێ هەتا هەنووی، هۆ نەموت مووی بگەینەرە مووی!».

٢٩. لە زەمانی ئەوڕەحمان‌پاشای باباندا کابرایەك چووە ماڵی پیرێژنێك و سواری بوو. پیرێژنەکە وتی: ئەرێ کوڕم دەنگوباس

چییە؟ کوڕەش وتی: بەخوا نازانم ئەوەندە ئەزانم پاشا ئەمری دەرکردووە ساڵێکی تەواو ئەبێ سواری پیرێژن بین. پیرێژن وتی: فەرمانێکی چەند بە ڕێ و جێیە.

پیرێژنە کچێکی هەبوو لەولاوە گوێی لێ بوو، بە دەم نووکەنووکەوە وتی: گوایە ئێمە گوناحمان چییە وا پاشا قسەیەکی لە ئێمەشەوە نەکردووە؟ پیرێژنەکە خێرا هەڵیدایە وتی: چەنە لێ مەدە. تۆ گریانەکەت فرمێسکە، من گریانەکەم خوێنە، من ناتوانم پێچەوانەی فەرمانی پاشا بکەم، ئیشی خۆت بکە کوڕم!».

٣٠. کابرایەك هەبوو خەڵکی ئەو «هەجیج»ـە «زۆراب»ـی ناو بوو، تەریدە بووبوو، کەوتبووە سابڵاخ. لەوێ وا دیار بوو لەوەڕی بە خۆش زانیبوو گیرسابووەوە. کەسی نەبوو هەر خۆی بوو. شێوەی ژیانیشی ئەوە بوو گوێقوڵاخ ئەبوو بۆ ئەوە لە چ شوێنێك وەیا لە چ ماڵێك بانگێشتێك ببوایە، ئەچوو بەبێ بانگکردن خۆی پیا ئەکرد و دائەکوتا.

ڕۆژێك لە مزگەوتی سوور چەند کەسێك کۆ ئەبنەوە و بڕیار ئەدەن بچن بۆ سەیران. ئەمیش ئەچێ خۆی ئەکوتێتە ناویان. جەماعەتەکە هەریەکە شتێك ئەگرنە ئەستۆ. یەکێك ئەڵێ: نان لەسەر من، یەکێك ئەڵێ: گۆشت لەسەر من، هەریەکە شتێك ئەڵێن. نۆرە دێتە سەر خالۆ زۆراب، پێی ئەڵێن: ئەی چی لەسەر تۆ؟ ئەڵێ: «لەعنەتی خواش لەسەر من!». دەست ئەکەن بە پێکەنین و وازی لێ دێنن.

٣١. کابرایەك هەبوو بۆنی دەمی ئەهات. کابرایەکیتریش هەبوو گوێی کەڕ بوو. ئەوەی کە بۆنی دەمی ئەهات ئەیسرکان بەگوێی کابرای کەڕەدا، ئەویش ئەیوت: «بەخوا فلانی نازانم ئەڵێی

چی؟ ئەوەندە ئەزانم ئەتسی بە گوێما!»).

.٣٢ کابرایەکی میروەیسی جارێك ئەچێ بۆ حەج، نەختێ پەلە ئەکات و زوو ئەڕوا. کە ئەگاتە کەعبە خێرا پەلامار ئەدا و قوڵفی کەعبە ئەگرێ و ئەڵێ: «خوایە بم وەساقەت خێرا لە خۆم و باوك و دایکم خۆش بوە تا خێڵ بەرۆکی نەگرتگی!».

.٣٣ مەلا مەحمووی حاجی‌عەلی هەبوو لە سولەیمانی، جارێك پێشنوێژی ئەکا لە نوێژی عیشادا، فاتیحە ئەخوێنێ و پاشان ئەڵێ: «الم غُلِبَتِ التُّرك». یەکێ لە نوێژکەرەکان غەڵەتەکەی ئەداتەوە ئەڵێ: ﴿غُلِبَتِ ٱلرُّومُ﴾. ئەویش هەر لەناو نوێژەکەدا ئەڵێ: «گوێی مەدەرێ هەموویان دوژمنمانن!». ئەمە ئەڵێ و لەسەر نوێژەکەی خۆی ئەڕوا.

.٣٤ پیاوێك هەبوو سۆفی ڕەمەزانی ناو بوو، ڕیشێکی زلی پێوە بوو. جارێك ئەپرسێ لە شێخ بابەعەلی تەکیەیی لە سولەیمانی ئەڵێ: یا شێخ! لە کاتی دەستنوێژ شتنا ترسم هەیە ڕیشم تەڕ نەبێ. ئەڵێ: پەنجەی تێ‌خە؛ ئەمە پێی ئەڵێن خەلەلە. شەرع هەر ئەوەندە داوا ئەکا. ئەڵێ: بەخوا یا شێخ دڵم وەسوەسە ئەکا. ئەڵێ: «کەواتە هەر لە شەویەوە بیخەرە ناو ئاو تا بەیانی ئەخووسێ، ئەو وەختە وەسوەسەت نامێنێ!».

.٣٥ کابرایەکی زۆر پیر لەو سەرە هەبوو ژنێکی گەنجی زۆر جوانی هێنابوو. کابرا لەوانە نەبوو بە کەڵك بێت. کوڕێکی گەنجی دراوسێیان هەبوو، ژنە لەگەڵ کوڕەکەدا بە ناوی ئامۆزاوە ڕێ کەوتبوو، ئیتر ئامۆزا هەموو وەختێ لە ماڵی ئەمان بوو. لە پاش چەند ساڵێك، خوا

چەند منالێکی دا بەم پیاوە. چۆن ئەمانە خێزانی ماڵ بوون، کوڕەی ئامۆزاش بەو جۆرە یەکێك بوو لە خێزانی ماڵەکە؛ تەنانەت ئەگەر بۆ دەریشەوە بچوونایە، ئامۆزاشیان هەر لەگەڵ بوو.

ڕۆژێك ئەو خێزانە هەموو ئەچن بۆ سەیران. دۆستێکی کۆنی پیاوەی پیرە تووشیان ئەبێ و لەگەڵ کابرادا چاك و چۆنی ئەکا و ئەپرسێ: ئەمانە کێن و چین؟ ئەڵێ: ئەوەیان کوڕمە و ئەوەیان کچمە و ئەوەیان ژنمە. ئەڵێ: ئەی ئەو کوڕە گەنجە کێیە؟ ئەڵێ: «ئەوەش کێرمە!».

.٣٦ مەلایەك لە کۆڕێکا وەعزی دائەدا و باسی جبرەئیلی ئەکرد ئەیوت: کە ئەمری پێ بکرێ بە قودرەتی خوا کە شاپەڕی دایە ژێر زەوی، سەروبنی ئەکا. لە کۆڕەکەدا ژنێکی لێ بوو، لە تەنیشت دۆستەکەی خۆیەوە دانیشتبوو. خەڵکەکە هەموو سەرگەرمی ئەو پەڕی جبرەئیلە بوون، ژنەکە گۆشەیەك لە چارشێوەکەی دابوو بەسەر کۆشی دۆستەکەیا، لە ژێرەوە دەستی برد دەعباکەی گرت. کە گرتی دەعباکە وەکوو شاخی لێ هات، ژنە بەبێ ئیختیار چریکەیەکی کرد. مەلاکە گوێی لێ بوو وتی: «ئەی عاشقەی سادقەی موحسنەی متفانیەی محافزەی موخەدیرەی مونەووەرە! ئەوە پەڕی جبرەئیل گەیشتە دڵت؟ وەیا هەواکەی دای لە لەشت؟ وا بەم جۆرە بەبێ ئیختیار ئەو نەعرەتەیەت کێشا؟» ژنە وتی: «من پەڕی جبرەئیل نازانم کە بدا لە دڵم وەیا لە گیانم، کوتوپڕ شاخی ئیسرافیلم بەردەست کەوت، ئەم چریکەیەم لەبەر ئەوە بوو!».

.٣٧ کابرایەکی کورد ڕێی ئەکەوێتە ئەستەموڵ، سەر و ڕیشێکی زۆری دێ و بۆی ڕێ ناکەوێ بیتاشێ. کابراش ناوی عەلی ئەبێ و لە وڵاتا پێیان ئەوت: ئەلی. کابرایەکی ئەستەموڵی تووش ئەبێ

لێی ئەپرسن: «نێرەلی‌سەن؟» ئەڵێ: وە قوروانت وم ئەوە وە ڕیشما ئەزانی نێرم، ئەی وە چیدا ئەزانی ئەلیم ناوە؟!.

٣٨. کابرایەکی شاتری ئیشێکی بەسەرا دێت و لە ترسا سەری خۆی هەڵئەگرێ بەو وڵاتانا و خۆی ون ئەکا، ئەچێتە بەغدا و لەبەر دووکانێکا ئەیەوێ شتێك بکڕێ. کابرای خاوەن دووکان ئەڵێ: «شترید؟» ئەڵێ: گووی تۆی لێ نەوارێ هەر تۆ ماویت نەزانی من شاتریم ئەوا تۆیش زانیت!».

٣٩. کابرایەکی کورد لە غەزا ئەگەڕێتەوە ئەگاتە بەغدا. کابرایەکی بەغدایی پێی ئەڵێ: «گۆە». ئەویش ئەڵێ: دەویت باوك خۆت گوویت من لە غەزا دێمەوە. لە پاشا تێی ئەگەیەنن ئەڵێن: ئەوە ماندوو نەبوونت لێ ئەکا.

٤٠. لەو خۆشناوە کابرایەك چاوی ژانی ئەکرد، پوورزایەکی هەبوو چووە لای وتی: پوورزاگیان چاوم زۆر ژان ئەکا نازانم چی لێ بکەم؟ پوورزاشی پێی وت: «پوورزاگیان، من پار ددانم ژانی ئەکرد هەڵم‌کەند!».

٤١. لە زەمانی شێخ مەحموودا لەشکری مەحموو لە «جاسەنە» ئەبن. تەیارە دێتە سەریان شپرزەیان ئەکا. ئامۆزایەکی کوێخا حەسەنی «کانی‌گۆمە» هەبوو ئەویش لە لەشکرەکەی شێخ مەحمووا بوو. لەشکر شپرزە ئەبێ و هەریەکە ئەیەوێ بۆ خۆی دەرباز ببێ، ئەو ئامۆزای حاجی حەسەنەش بە پەلە ماینەکەی دێنێ و لەبەر شپرزەیی بەرەواژە سواری ماینەکە ئەبێ. پێ ئەڵێن: کوڕە! خوا بتگرێ ئەوە تۆ چۆن

سوار بووی؟ ئەوە بەرەواژەیە. ئەویش ئەڵێ: «کوڕە، من بەرەواژە سوار نەبووم، ماینە سەگباب خێوەکە خۆی هەڵگێڕاوەتەوە و بە باری چەپدا ڕاوەستاوە!».

٤٢. عێل لە کوێستان بوو. کوێرەدێیەك هەیە لەو ناوە «دواوە»ی ناو بوو. جارێك مەحمووپاشا «فەقێ شێتە» ئەنێری بۆ دواوە. هەرچەندە ساڵ زوو بوو، بەڵام لەبەر ئەوە ئەو وڵاتە کوێستانە، هەر زوو باران و زستان دێت. لە ڕێگەدا ئەیکا بە باران و قوڕوچڵپاو. لەو کاتەدا ژن و پیاوێك بێشکەیەکیان پێیە و لەو ناوەدا لە ژێر ئەو بارانەدا ئەسووڕێنەوە. فەقێ شێتە ڕێگای لێ تێك چووبوو، ئەچێتە لای پیاو و ژنەکە ئەڵێ: ئەرێ توخوا برا ڕێگای دواوە کامەیە؟ کابراش ئەڵێ: «ئەرێ کابرا تۆ شێتیت؟ ئەگەر من ڕێگای دواوەم بزانیایە لە ژێر ئەم بارانە و لەناو ئەم چڵپاوە بە ژن و منالێکەوە بۆ گیرم ئەخوارد؟» فەقێ شێتە کە ئەمە ئەبیەت جامانەکەی سەری ئەکاتەوە و ئەیکا بە دەسەسرێ دەستی و لە تەنیشتیانەوە دەست ئەکا بە هەڵپەڕکێ و بە چۆپی کێشان!.

٤٣. کابرایەکی کورد ساڵێك ئەچێ بۆ حەج، لە کاتی تەوافا جامانەکەی لێ ئەدزن. حاجی مستەفا پاشا وتی: وا ڕێ کەوتبوو من لە پشت ئەو کابرایەوە بووم، گوێم لێ بوو هەر ئەیوت: «بینایی چاوان! ئەمجارە هاتم بۆ خزمەتت، فەرمووت: جامانەکەم بدزن! ئەگەر جارێکی کە منت لێرە چاوپێکەوت بفەرموو: هەرچێ دەم و دگانم هەس بیشکێنن وەسەر یەکا!».

٤٤. قازییەك هەبوو لە هەڵەبجە، ڕۆژێك ژنێك ئەچێتە لای شکات لە مێردەکەی ئەکا. ژنەکە دوو چاوی زۆر جوانی پێوە بوو،

سەرپۆشەکەی هێنابوو بەسەر ڕوومەتیا، هەر چاوەکانی بە دەرەوە بوون، مێردەکەشی لەگەڵ بوو.

قازی چاوی ژنە بە تەواوی کاری تێکردبوو، هەر قسەیەك ئەو ئەیوت، ئەم ئەیوت: ڕاست ئەکەی. هەرچییەکیش مێردەکەی ئەیوت، ئەیوت: درۆ ئەکەی. مێردە هەستی کرد ئیش لە کوێدایە، هەر دەستی برد سەرپۆشەکەی لەسەر ژنەکە لادا و ڕوومەتی دەرکەوت. قازی سەیری کرد ڕوومەتێکی زۆر ناشیرینی هەیە، دڵی پێکا هات وتی: «هەستە برۆ ژنە، چاوی مەزڵوومانت هەیە و ڕووی زاڵمان. لەلای مێردی خۆت دانیشە! شەرع ئەفەرموێ: ڕوومەت لە مێرد و لە قازی ناپۆشرێ!».

٤٥. کابرایەکی توجار هەبوو لەو سەرە بارخانەی بار کرد و چوو بۆ تەورێز. وا ڕێ کەوت لەوێشەوە چوو بۆ ڕووسیا. کاروانەکەی چەند ساڵێ درێژەی کێشا. خزمەتکارێکی ڕەش‌پێستی کەچەڵیان لە ماڵا هەبوو، وا دیار بوو خانم لەگەڵیا ڕێ کەوتبوو و دوو خوڵامی تۆی لێ بووبوو.

ڕۆژێ خەبەریان دا کە وا ئاغە هاتەوە. کابرای خزمەتکار مناڵەکانی هەڵگرت و یەکێکیانی خستە سەر شانی و ئەوی‌کەشیان بە شوێنیەوە، چوون بە پیر ئاغەوە. ئاغە مناڵەکەی سەر شانی چاوپێ‌کەوت وتی: ئەمە هی کێیە؟ وتی: هی خانمە. ئاغە وتی: بەخوا سەیرە. کابرا وتی: «ئەوی بە شوێنمەوەیە، ئەو سەیرترە!».

٤٦. کابرایەکی دزەیی بارە گەنمێکی بردبوو بۆ هەولێر. لەناو شارا کەرەکەیان لێ دزی بوو، ئەویش چوو ملی کەری کابرایەکی خۆشناوی گرت، هێنای باری خۆی لێ‌نا و ڕۆیشت. کابرای خۆشناو هات وتی: ئەم کەرە، کەرەکەی منە. کابرای دزەیی وتی: هی خۆمە. خەڵکوخوا

کەوتنە بەینەوە بە دزەییەکەیان وت: کەرەکەی تۆ نێرەکەر بوو یا ماکەر؟ وتی: نێرەکەر بوو. وتیان: دە ئەمە ماکەرە. وتی: «بەڵێ کەرەکەی منیش نێرەکەرێکی تەواو نەبوو، ئەمەش ماکەرێکی تەواو نییە؛ کەواتە هەر کەرەکەی منە!».

٤٧. کابرایەکی یۆسۆجانی لەو کاتەدا کە عێل بار ئەکا بۆ کوێستان، دانی دێتە ژان و ئارامی لێ هەڵئەگرێ. پێ ئەڵێن: وەستا لە کفری[یە] بچۆ بیکێشە، ئەویش دێتە کفری و ئەچێتە لای پیاوێکی سەرتاش ئەڵێ: «دگانم ژان ئەکا بیم وە ساقەت! بۆم دەربێرا». ئەڵێ: باشە باوکم، دوو قڕان بدە تا بۆت دەربێنم. ئەڵێ: برا خوا هەڵناگرێ دوو قڕان، هەر قڕانێکت پێ ئەدەم. کابرا نایکێشێ.

کابرای یۆسۆجانی ئارامی لێ هەڵئەگیرێ و ئەڵێ: برا بێژم چی، دەری بێرانە. ئەمجا دانێکی پیشان ئەدا کە ژان ناکا ئەڵێ: ئەوەسە. کابرای وەستا ئەو دانەی دەردێنێ. پاشان کابرای یۆسۆجانی ئەڵێ: «بەخوا برا ئەو دگانە نەو، ئائەمەسە کە ئێستە پێت ئێژم». پەنجە ئەخاتە سەر دانە ژان کردووەکە و وەستا ئەو دانەشی دەردێنێ. پاشان دوو قڕانەکەی ئەداتێ. ئەمجا پێی ئەڵێ: «هەی دەویت باوك! تۆ گەرەکت بوو دوو قڕانم بۆ دگانێ لێ بسێنی، وا ئەزانی هەروا پارە بەلاشە! ئاوا دایکت ئەگێم، دوو دگانم پێ دەرهاوردی وە دوو قڕان؛ هەر دگانێك کەوتە قڕانێك. ئیتر جارێکیتر نەیژی کوردە شت نازانێ، ئاوات لێ ئەکەم!».

٤٨. لەو مەنگوڕایەتییە مامۆستا وەعزی ئەدا ئەیوت: پردی «صِراط» لە موو باریکترە و لە شیر تیژترە. ڕۆژی قیامەت ئەو پردەش وا بەسەر جەحەنەمەوە، ئەبێ هەموو کەس بە سەریا تێپەڕێ.

کابرایەکی مەنگوڕ وتی: مامۆستا لەوێ هیچ دارێك هەیە کە پیاو دەستی پێ بگرێ و بپەڕێتەوە؟ مامۆستا وتی: نەوەڵڵا هیچ نییە. وتی: «وەڵڵا دەسا مامۆستا بە گۆڕە بابم تۆ بە ڕیشی خۆت پێدەکەنی، ئەگینا ئەگەر خەڵك مەلیش بێ بە سەریا ناتوانێ تێپەڕێ!».

٤٩. مەلا سمایل ساڵێك لە «زێویە» وەعزی ئەخوێند، لە وەعزەکەدا وتی: «هەرکەسە ناوی باوە ئادەم و دایە حەوا بنووسێ لە ماڵەکەی خۆیا و هەڵیواسێ، شەیتان ڕوو ناکاتە ئەو ماڵە. هەریەکە سەرقەڵەمانەیەك بێنن تا بۆتان بنووسم».

کابرایەکی قەرەداغی لەوێ بوو هەستا وتی: «مامۆستا ئەوە چی ئەفەرمووی؟ شەیتان لە بەهەشتا لە بن دەست خواوە چوو هەڵیفریواندن، ئێستە کۆ لە ناوەکەیان ئەکاتەوە لەم دوورەوە؟!». مەلا سمایل وتی: هەروا ئیتر واقم وڕ ما.

٥٠. لە شەیتانیان پرسی: تۆ کام دەستەت زۆر خۆش ئەوێ؟ وتی: دەلاڵ. وتیان: بۆچی؟ وتی: «چونکە من بە درۆ و دەلەسەکەیان زۆر زۆر خۆشحاڵ ئەبووم، ئەوان هاتن سوێندی درۆیشیان خستە پاڵی!».

٥١. ئەڵێن پاشایەك سێ ژنی هەبوو؛ فارسێك و کوردێك و فیتەیەك. شەوێك لەلای ژنە فارسەکە نوستبوو لێی پرسی: شەو لە چ وەختێکایە؟ وتی: بەری بەیانە. وتی: بە چیدا ئەزانی؟ وتی: گوڵ و ڕەیحان بۆنی بڵاو کردۆتەوە و باڵندەکان کەوتوونەتە ئاواز خوێندن.

شەوی دووەم لەلای ژنە کوردەکە بوو وتی: دنیا چ وەختە؟ وتی: بەری بەیانە. وتی: بە چیدا ئەزانی؟ وتی: ملوانکە مرواریییەکەم ئەکەوێ لە سینگم ساردی ئەدا بە سینەم.

شەوی سێیەم لەلای فیتی نوست. وتی: چ کاتە؟ وتی: بەری بەیانی. وتی: بە چیدا ئەزانی؟ وتی: «گووم دێ!».

٥٢. لە زەمانی حەمەپاشای جافدا زستانێکی قاتوقڕ پەیدا ئەبێ و ماڵات هەموو قڕ ئەکا. جافەکان ئەچنە لای حەمەپاشا ئەڵێن: پاشا کوچکت لێ نەوارێ چلەمان بۆ کورت کەرەوە ماڵات هیچی نەما هەمووی قڕ کرد. ئەویش ئەڵێ: هەریەکە لە چل قڕان قڕانێکم بۆ بێنن تا بیدەم وە چلە خۆی کورت کاتەوە. ئەوانیش ئەچن بۆی دێنن و ئەیدەنێ.

٥٣. کابرایەك فرە دڵی لە یارەکەی چووبوو، عەشقی ئەو کردبووی بە شاعیر. جا ئەم شیعرانەی بە باڵای یارەکەیا ئەوت:

بەقوربانی ئەو خاڵەی بە ڕوومەتی یارەوە
ئێـــژی مێـــوژە و بـــە دیـــوارەوە
بـــەژن و باڵاکـــەت بـــۆ مـــن دەوایـــە
ئێـــژی دارعەســـای دەســـتی مەلایـــە

٥٤. ژنێـك هەبـوو «خادایـە»یان پـێ ئـەوت. زەمان هێنابووی بە سەریا، سەردەمی جارانی نەمابوو، تەشیڕێسی ئەکرد بۆ ئەم و ئـەو. «مـەلاژن فاتـم» هەبـوو، ڕۆژێـك هەندێ خوری ئەباتە لای بۆی بڕێسێ. ئەویش بۆی ئەڕێسێ و پاشان بۆی ئەچێتەوە. کە سەیری ئەکا ئەڵێ: ئەمـە ئەسـتوورە. خادایە هەڵیئەوەشێنێتەوە، بۆی ئەڕێسێتەوە. ئەمجا بـۆی ئەچێتەوە. سـەیری ئەکا ئەڵێ: ئەمە باریکـە. خادایە ئەڵێ: خافاتـم نازانـم چۆنـت ئـەوێ؟ باریـك ئەیڕێسـم ئەڵێـی: ئەمـە باریکـە، ئەستوور ئەیڕێسم ئەڵێی: ئەستوورە. خافاتمیش ئەڵێ: «خادایە نە باریك و نە ئەستوور، وەك هێنەکەی مەلا، گردەڕێس بێ!».

٥٥. «حاجی مەلا ساڵحی کۆزەپانکە» و «حاجی مەلا عومەری هۆمەرکونبەتی» هاتنە لام. دنیا گەرم بوو، وتیان: ئاوی سارد ئەخۆینەوە. ئەو پیاوەی کە لام بوو هەر مامپیرداودمان پێ ئەوت، پێم وت: بچۆ ئاوی سارد بێنە. مامپیرداود چوو بەفری هێنا و خستیە ناو سەتڵێکی گەورەوە پڕی کرد لە ئاو و هێنای تەق، لە بەردەمی حاجی مەلا ساڵحا داینا. حاجی مەلا کە ئەمەی چاوپێکەوت وتی: دەك مردیت مرێ پیرداود! هەر فیکەکەی ماوە! دوو فیکەشمان لۆ بکە. مامپیرداود هیچی بۆ نەمایەوە وتی: قوربان هەموو جار هەر وا دەکەم!.

٥٦. عێل سەرەوخوار بووەتەوە ڕووەو کوێستان، هەر هۆزە شوێنی خۆی گرت. کابرایەکی گۆران لە «دیواندەرە» خانووی ئەکرد، دیرەکی خانووەکە تۆزێ دوور بوو لە ئاواییەوە. دۆستێکی لە عەشرەتەکە هەبوو خاڵە مارفیان پێ ئەوت. خاڵە مارف ڕۆژێك گایەکی دابووە بەر. کابرا وتی: خاڵە مارف بەڵکوو ئەو حەماڵەم بۆ بخەیتە پشت گا بۆر و بیبەینەوە بۆ ناو دێ. ئەویش وتی: بە بانی چاوان. داریان خستە سەر گا بۆر و بردیانەوە؛ کابرا هۆڕێکی گەنمی داگرت و خاڵە مارف خستیە پشتی گا بۆر و گەڕایەوە بۆ هۆز.

ئەو ساڵە بەسەر چوو؛ کابرا خانووی دروست کرد و عێل دیسان کە گەڕایەوە بۆ کوێستان، خاڵە مارف سەرێکی لە کابرای گۆرانەی دۆستی دا. سەیری کرد خانووەکەی تەواو کردووە. وتی: «ماشەڵڵا خانگی چاکە. ئافەرم گابۆر، بەخوا ئەو حەماڵەی خاس هەڵگرتبوو» کابرا بارێکی‌تری گەنمی بۆ داگرت و چوو و ساڵێکی‌تریش هەروەها بارەگەنمێکی‌تری بۆ داگرتەوە!. ساڵی چوارەم دیسان هاتەوە وتی: «ماشەڵڵا خانگی چاکە.

ئافەرم گابۆر بەخوا ئەو حەماڵەی خاس هەڵگرتبوو». کابرا ئیتر لە وزەیا نەما وتی: خاڵە مارف تکات لێ ئەکەم ئەوا ئێستە هەڵئەستم خانووەکە هەڵئەوەشێنمەوە، حەماڵەکە بخەرەوە سەر پشتی گابۆر و بیبەرەوە بۆ ئەو شوێنە کە هێناویە!.

٥٧. ساڵێك لەو سەرە کابرایەکی کورد حەمەوەیسی ناو بوو، ئەچێتە «بس». شەوێ میوانی ماڵێك ئەبێ، لە پاش ئەوە کە نووستن، لە نیوەشەوا ئیشی سەرئاو تاوی ئەدا. هەڵئەستێ بچێتە دەرەوە، سەیر ئەکا گەماڵێکی بۆر لە بەردەرگا کەوتووە و دەستی کردە مڕەمڕ لێی، نەیوێرا بڕوا. دەستی کرد بە خۆ هەڵگوشین، کەڵکی نەبوو، گوو تاوی دا! منالێکی ماڵەکە بوو لەناو بێشکەدا، بە دزییەوە چوو دەسرازەی منالەکەی کردەوە و منالی بەرز کردەوە و پڕ گۆزەڵەی ژێر منالەکەی کرد لە گوو، منالەکەی خستەوە شوێنی خۆی و دەسرازەکەی پێچایەوە و هاتەوە سەر جێگاکەی خۆی نوست.

بەیانی دایکی منالەکە کە منالی بەرز کردەوە نفوراتێکی چاوپێکەوت، بانگی مێردەکەی کرد وتی: پیاوەکە ئەمە چییە؟ ئەمە گووی ئەم منالە نییە و نازانن مەسەلەش چییە. بە هەرجۆر بوو دەنگیان نەکرد. شەوی دوایی چەشنی کارەسات ڕووی دایەوە، بەلام گەلێ خراپتر لە دوێنێ شەو. ژنە و پیاوەکە کەوتنە مقۆمقۆ لە بەینی خۆیانا، کابرای میوان گوێی لێ بوو هەڵیدایە وتی: «برا ئەوەی پێ ناوێ تا ئێوە خاوەنی ئەو گەماڵە بۆرە بن، منالەکەتان گووی لەوە بتەوتر ئەکا!».

٥٨. قانعی شاعیر وتی: ساڵێك لەو ناو جافە مەلا بووم. وتیان: مامۆستا وەعزمان بۆ بێژە، وتم: برا بە کوردی یا بە عەرەبی؟

وتیان: برا وە کوردی، ئێمە چووزانین عەرەبی. وتی: منیش کتێبم نایە بەردەستم؛ چاوم کز بوو، عەینەکەکەم خستە بەر چاوم و گەرووم پاك کردەوە و وتم: «دێڵەسەگی کوڕی باوکی کانییەکەی هەرات ئەفەرمووێ:»!

هەر ئەمەم وت وتیان: مامۆستا ئەوە ئێژی چی؟ وتم: برا وەعزتان بۆ ئێژم. وتیان: کوچکت لێ نەوارێ کەی وەعز وا ئەوێ؟ وتم: برا ئاخر ئێوە ئەڵێن بە کوردی، من لە باتی ئەوە کە نووسراوە و ئەڵێ: «معاویە ابن ابی سفیان» من بە کوردی پێم وتن. وتیان: کوڕە کوچکت لێ وارێ خاس بێژە، دە بێژە. وتی: وتم: «ڕێوی کوڕی چۆلەکە ئەفەرمووێ:» هاتم ئەوی‌تر تەواو کەم وتیان: مردگت مرێ ئەوە ئێژی چی؟ وتم: برا من سەرم سڕ ماوە بە دەست ئێوەوە. ئێوە ئەڵێن بە کوردی، لە کتێبەکەدا نووسراوە: «ثَعلَب ابن عُصَفور» من کردم بە کوردی. وتیان: «هەڵسە هەڵسە مەلا بڕۆ گاڵت وەپێچەوە وەو شێخ کەریمە ئیتر پیا نایینی!». وتی جوان و پوخت دەریان کردم.

**٥٩.** جارێك لە قەڵادزێ لە ماڵێکا بانگێشت ئەبێ و نان لەسەر سینی دائەنرێ. هەر دوو کەس لەسەر سینییەك ئەبن. شێخ حسێنی بوسکێن و کاکەسووری کۆیی پێکەوە لە سەر سینیەك ئەبن. گۆشتێکی چەور و قەڵەو بەسەر دەوری برنجەوە ئەبێ. کاکە سوور بە قسە شێخ حسێن خەریك ئەکا و خۆی تەنگ بە گۆشتەکە هەڵئەچنێ. خدراغای پشدەریش لەسەر سینییەکی‌تر ئەبێ لە نزیکیانەوە، سەیریان ئەکا و ئەزانێ ئەوا کاکەسوور بۆیە شێخ حسێنی خەریك کردووە لەبەر گۆشتەکەیە. لایەك لە شێخ حسێن ئەکاتەوە و ئەڵێ: «شێخ حسێن تۆزێ تێ مرێنە!».

٦٠. مەسعوود محەمەد لە سولەیمانی ئەبێ. خدراغای پشدەر لەگەڵ ژنێکا لەو پشدەرە هەرای مڵکیان ئەبێت، بەو ناوە کە مەسعوود حاکمە لە سولەیمانی، ئەچێتە لای ئەڵێ: «کاک مەسعوود پیرێژنێکی قۆڵتڕ بە هەردوو دەست هەردوو گونی من و سلێمان برامی گرتووە». مەسعوودیش ئەڵێ: جا من چی لێ بکەم؟ ئەڵێ: «چی چی لێ بکەم؟ گونمان لە دەست ئەم پیرێژنە بەرەڵا کە، ئەی تۆ ئیشت چییە دانیشتووی لێرە؟». (ئەمە کاک مەسعوود خۆی بۆی گێڕامەوە).

٦١. ساڵێك زستانێکی تۆف ئەبێ، دەستەیەکی خەڵکی دێی «زاخە» ئەچن بۆ «سەقز» و ئەگەڕێنەوە. لەو کوێستانی ساراڵ و هۆبەتووە لێیان ئەکا بە کڕێوە و سەریان لێ تێك ئەچێ و سەرما کەسیرەیان ئەکا. لە بەینی خۆیانا دەست ئەکەن بە نەزر و مەولوویی کردن بۆ ئەوە بەڵکوو ڕزگاریان بێ و دنیایان تۆزێ لێ خۆش بکا. یەکێکیان گایەك ئەکا بە مەولوویی، یەکێکیان ئەڵێ: ئەگەر ڕزگار بووین بەرانێك مەولوویی بێت.

بەم جۆرە هەریەکە شتێك ئەکەن بە نەزر. یەکێکیان ئەمێنێتەوە، هیچ شك نابا بیکا بە مەولوویی ئەڵێ: «خوایە تۆ خۆت ئەزانی من هیچ شك نابەم، هەر فاتەی ژنم نەبێ، تەلاقێکی کەوتبێ لە ڕێگای تۆدا هەر لەم کڕێوە سەرێك دەرکەین و نەمرین!».

٦٢. مەلا «فتح‌الله»ی هەرتەل لە گوندی «بێتواتە» ئەگەڕێتەوە بۆ گوندی هەرتەل. لە ڕێگادا تووشی شوانێك ئەبێ، لێی ئەپرسێ: مام شوان پەزێتە ئەچەندن؟ ئەڵێ: مامۆستا ئەپێنجن. ئەڵێ: ئەچەند مێنە؟ ئەچەند نێرن؟ ئەڵێ: مامۆستا دوو ئەنێرن سێ ئەنێرن.

ئەڵێ: ما ناری هەر نێر پێنجن؟ ئەڵێ: مامۆستا ئاخر من وەکوو تە، سەفیح نیمە! ئەڵێ: لەپکەت زمان کەوێ، ئەرێ زارت لە زیانیدا نینە.

٦٣. ژن و پیاوێك لە ڕۆژێکی مانگی ڕۆژووەتیدا خەریکی ئیشە خۆشەکە بوون. پیاوەکە هەر لەو کاتەدا ویستی ژنەکە ماچ کا، ژنە دەستی گرت بە دەمی کابرادا وتی: «نەکەی شتی وا، کەراهەتی هەیە ماچ کردنەوە بە زمانی بەڕۆژووا!».

٦٤. «نجم‌الدین» مەلا هەبوو لە سولەیمانی، پیاوێکی قەلەندەر و بێ‌پەروا بوو. ژیانی نەجمەدین مەلا، ژیانێکی سەیر بوو. تەمەنێکی درێژی هەبوو، سەری هەر ڕەش بوو. لە ڕانیە ژنێکی هێنابوو تەلاقی دابوو، کچێکی لێ هەبوو کچەکەشی مردبوو. ئیتر دواچۆڕی بە هەموو شت هێنابوو. لەسەر جادەکەی سابوونکەران دووکانێکی بە کرێ گرتبوو، بە ڕۆژ بە منالانی ئەخوێند، بە شەو دیوانە کوردییەکانی ئەنووسییەوە. لە بارەی زمانی کوردییەوە خزمەتێکی زۆری کردبوو. نووسینی بۆ ڕۆژنامەی ژینیش ئەنووسی. دوو پشیلەی کەللە گەورەشی هەبوو، بە گۆشت و سی بەخێوی ئەکردن. سەودایەکی تەواویشی هەبوو لەگەڵ خواردنەوەدا؛ بەتایبەتی بە شەو؛ دەڕابەی دووکانەکەی لەسەر خۆی دائەدایەوە و بە یادی ڕابوێرانی کۆن ڕایئەبوارد. ژوورەکەشی لەماڵەکەی باجی زەمزەم ئەچوو.

شەوێك ئەوا دەڕابەکەی لەسەر خۆی داوەتەوە و کات پاش نیوەشەوە، هەر لەبەر خۆیەوە دایگرتووە ئەڵێ: «هەیە، کوڕە هەیە». ئێمەش بەوێدا تێپەڕین. بە هەرجۆر بوو دەڕابەکەمان پێ هەڵدایەوە و چووینە ژوورەوە. ئەو هەر ئەڵێ: «هەیە». ئێ بابە چی هەیە؟ ئەڵێ:

هەیە. لە ئەنجاما بە هەرجۆر بوو پێمان دەربڕی وتی: «خوا هەیە». ئەوە سەرخۆشیشە، وتمان: چۆن؟ وتی: خوا هەیە، بەڵام ئیشەکانی قۆڕە!. لەمە سەرمان سڕ ما! وتمان: بۆمان بڵێ ئەمە چۆنە؟ وتی: من برسیمە، چوار پوولم هەبوو، نانێك بە پێنج پوولە. ئەوەتە نانەواخانەکەش بەرانبەرمە، پوولێکیترم نەبوو نانێکی پێ بکڕم. نانەواخانەکە هەڵیگرت. هەر کە نانەواخانەکە هەڵیگرت دوو دیناریان بۆ هێنام! ئەوەش دوو دینارەکەیە، بەڵام نان نییە. ئەمجا گەڕایەوە سەر «هەیە، هەیە»کەی خۆی. ئیتر ئێمەش چووین بەو شەوە نانمان بۆ هێنا و تێری خوارد. وتمان: ئەمجا ئیتر زیاتر بڵێ: هەیە.

٦٥. «بلەی عاسە» هەبوو لە سولەیمانی لەلای «زێوەر»ی شاعیر ئەیخوێند. گەلێ منالّیتریش بوو، هەر کە زێوەرەفەنی ئەچووە ژووری پۆلەکەوە، بلە دەستی ئەکرد بە گریان و دەستی بەرز ئەکردەوە و دەستی ئەکرد بە پاڕانەوە. زێوەرەفەنیش ئەیوت: سەگ جسن، من هێشتا هیچم لێ نەکردووی، هیچم لێ نەپرسیوی، لێم نەداوی، بۆچ وا ئەکەویتە پاڕانەوە و گریان؟ ئەویش ئەیوت: «ئەفەنی ئەگەر لێم بدەی زۆرتر ئەگریم!». ناچار وازی لێ ئەهێنا.

٦٦. حاجی ئەمینی کاکە حەمە گێڕایەوە وتی: زوو جوولەکەیەك هەبوو خواجە شەلەمۆی ناو بوو، دروادسێ دووکان بووین لە خانەکەی ئێمەدا. ئەویش تاجر بوو، بەڵام وەکوو منالّی بەردەستمان وابوو، هەر ئیشێکمان ئەبوو هەر بەومان ئەکرد. بەتایبەتی من، هیچ لە قسەم دەرنەئەچوو. تجارەت لەگەڵ مووسڵ و بەغدادا ئەکرا کە خواجە شەلەمۆ ئەچوو بۆ یەکێك لەو شوێنانە دراوسێ دووکانەکان لێی کۆ

ئەبوونەوە، ئەو ئەیوت: خواجە ئەو سەد لیرەیەم بۆ بدە بە فلان‌کەس، ئەو ئەیوت: ئەو پێنج سەد مەجیدییەم بۆ بدە بە فلان تجار لە بەغدا. ئێجگار لەگەڵ منا زۆر ڕێك بوو، تەنانەت وەختی وا ئەبوو میوانێك ئەهات بۆ حوجرە و کەس بە دەستەوە نەبوو، پێم ئەوت: خواجە شەلەمۆ توخوا بە زەحمەتی مەزانە بانگی چایەك بکە یا تۆزێ ئاو بێنە. ئەویش خوا هەقە هیچ درێغی نەئەکرد و هەروەکوو منالی بەردەستم لە بەردەستما هەڵئەسووڕا. ئیتر بە درێژی عومرمان ئەمە حاڵمان بوو.

ساڵێك بارخانەمان بار کرد و چووین بۆ ڕووسیا؛ چووینە «وارشەو». خواجە شەلەمۆیشمان هەر لەگەڵایە و ئەویش تجارێکە وەکوو ئێمە و بگرە زیاتریش. ڕۆژێك لە وارشەو ئیحتیاجی ئاوم بوو، وتم: توخوا خواجە شەلەمۆ بە زەحمەتی مەزانە مەسینەیەك ئاوم بۆ پڕ کە ئەمەوێ دەستنوێژێ بشۆرمەوە. ئەوەندەم زانی خواجە شەلەمۆ هەردوو چاوی سوور بووەوە و وتی: «وس، قسەی زیاد مەکە! چاوت بکەرەوە، ئێرەش سولەیمانی نییە هەر قسەی زیاد بکەی؛ ئێرە وارشەو و ڕووسیایە؛ پیاوی وام هەیە لێرە هەر کێری دوو ئەوەندەی ملی تۆ ئەستوورە. مەسینەم بۆ پڕ کە! وا ئەزانێ ئێرەش سولەیمانییە». وتی: وەڵڵا کە ئەمەی وت، ئیتر منیش هیچم پێ نەما.

٦٧. مامۆستا مەلا کەریمی بیارە ساڵێك لە بیارەوە بەڕێ ئەکەوێ بۆ ئەو دەوری تەکیەی لای خورماڵە لە شارەزوور، بۆ ناو خزمەکانی کە لە بەرەی قازیان بوون. لە ڕێگادا تووشی «قانع»ی شاعیر ئەبێ. ئەڵێ: قانع با بچین بۆ ناو ئەو خزمانە چەند ڕۆژێك لەوێ ڕائەبوێرین و ئەگەڕێینەوە. قانع ئەڵێ: باشە.

ئەچن، لە ڕاستیدا خزمان دێن بە پیریانەوە و چەند ڕۆژێك لەوێ ئەبن. هەر ڕۆژە نیوەڕۆ لە ماڵێك و ئێوارە لە ماڵێك بانگێشتنیان بۆ ئەکەن. قانع ئەڵێ: مامۆستا مەلا کەریم هاتی و نەهاتیم بە خۆم و خۆتا تاقی کردۆتەوە! تۆ هاتتە و من نەهاتمە. ئەڵێ: چۆن؟ ئەڵێ: تۆ دێیت بۆ تەکیە بۆ ناو خزمەکانت، ئەوەتە هەموو دەوڵەمەندن. هیزە ڕۆن لە لایەك کەوتووە، سوێنە پەنیر کڵاشە ئەکا، مەڕ و ماڵات خوا نەیبڕێ؛ هەر ڕۆژی بە بانگێشتن لەلایەکەوە دایانبەستووین. منیش ئەچم بۆ ناو خزمەکانم لە «کەولۆس» هەر لە کلکەی ئاوایی دەرئەکەوم سەگەکان دێن بە پیرمەوە. ئەوەندە شتیان لەبەر لاتی خزمەکانم لە ئاواییەکە دەست ناکەوێ، لەسەر کەوشە چەکەکانی پێم ئەبێ بە شەڕیان و یەکتری ئەخلۆپێننەوە. کاتێ کە ئەوان لەو گەرمەی شەڕەدان من خۆم لە دەستیان دەرباز ئەکەم و خۆم ئەکەم بە ماڵی یەکێ لە خزمەکانما. جا ئەوان حاڵی سەگەکانیان ئەوە بێ، ئەبێ حاڵی من چۆن بێ؟ کەوابوو ڕاستە تۆ هاتتە و من نەهاتمە!.

٦٨.ساڵێك لە سولەیمانی ئەویسترا زمانی کوردی دابنرێ لە شوێنی ئەو وشە عەرەبییانە کە بڵاو بووەتەوە. هەندێ لە گەنجە خوێنگەرمە کوردیزانەکان لە باتی وشەی «شورتەی مروور» وشەی «حەیتەی ڕەپی ماخوولان»یان بۆ دانابوو.

٦٩. مەلا شەفیع ئامۆژگاری حاجی برایماغای عەنبار ئەکا و پێی ئەڵێ: حاجی ئاغا تۆ ئێستە حەجت کردووە و نوێژ و ڕۆژووت هەیە و قورعان و دەلایل ئەخوێنی، مەعنای وایە بوویت بە پیاوێکی چاکی لەخواترس. ئیتر کەوتنە جەریمە و شتەی ڕەعیەتەکان مەکە و ماڵ و موڵکیان بە زۆر لێ زەوت مەکە، حەرامە. لەم ئاخری عومرەوە

ئیتر خۆت لە حەرامخواردن بپارێزە. حاجی برایماغاش ئەوا گوێی بۆ ڕاگرتووە و دڵی داوە بە قسەکانی و سەری داخستووە، پاشان سەر بەرز ئەکاتەوە و ئەڵێ: «ئەی مەلا شەفیع تۆ بۆچی دوو ساڵ لەمەوپێش حوشترەکەت بردە "دونگوزی سەرێ" و بۆشیان چاك نەکردی؟»

٧٠. ئەحەی جاو هەبوو لە سولەیمانی ڕۆژێك قڕانێکی پێ ئەبێ ئەچێتە مزگەوتی سەی حەسەن. کە ئەچێ بۆ سەر ئاودەستەکە پێی هەڵئەنگوێت و قڕانەکەی لێ ئەکەوێ و ئەکەوێتە درزی ئەرزی ئاودەستەکەوە. ئاودەستەکەش تاریك ئەبێ، دێت لە دەرەوەی ئاودەستەکە لووت شۆڕ ئەکاتەوە بەسەر ئەرزەکەدا و چاو ورد ئەکاتەوە بۆ قڕانەکە. خەڵك بەوێدا تێئەپەڕن ئەڵێن: ئەحەی جاو ئەوە بۆچی ئەگەڕێت؟ ئەڵێ: بەخوا تاکە تارانییەکم لێ کەوتووە بۆی ئەگەڕێم. ئەڵێن: جا کەوتە کوێ؟ ئەڵێ: وەڵڵا کەوتە درزی ئەرزی ئاودەستەکەوە. ئەڵێن: جا لێرە چۆن بۆی ئەگەڕێ؟ ئەڵێ: سەیری ئەو ئەقڵە کەن، من لەم ڕووناکییە نایدۆزمەوە، ئێستە لەو تاریکییە چۆن ئەیبینمەوە!؟.

٧١. ساڵێك زوو لە کەرکوك کابرایەکی کورد بلامانێ فێر بووبوو بە ژنە جوولەکەیەك. ڕۆژێك ئەچێ بۆلای ژنەکە بۆ ماڵەوە، لەو کاتەدا ـ خۆت تێئەگەی چ کاتێك ـ مێردەکەی دێتەوە! کە چاوی بەو کارەساتە ئەکەوێ پەلاماری کابرای کوردە ئەدا. کابراش پەلاماری ئەو ئەدا و ئەئاڵێن بە یەکا. هەندێ جار کابرای کوردە جوولەکەکە ئەخاتە ژێر، هەندێ جاریش جوولەکەکە ئەو ئەخاتە ژێر. ئەمە ژنەکەش وەستاوە و سەیریان ئەکا. جا لەو کاتەدا کە جوولەکە کابرای ئەخستە ژێر، ژنەکە ئەیوت: «ئادەی لێی دە ئەو حیز و دزە، دوێنێ فێر بووە

ئیمرۆیـش هاتووەتـەوە!». لـەو کاتەشا کـە کابرای کـورد جوولەکەکـەی ئەنایـە ژێـر ئەیـوت: «ئادەی لێی دە، دەسـت خۆش، خـۆی هیچی پێ ناکرێ نایەڵێ خەڵکیش بێن!».

٧٢. کابرایەکی جاف لەو وڵاتە گایەکی لێ ون بووبوو، شوێن نەما بەشوێنیا نەگەڕێ. بەدەم گەڕانەوە ڕێی کەوتە ناو دارستانێکی مـازوو، کـوڕ و کچێـك لـەوێ مـازوویان ئەکـرد. ئـەم ئەوانـی دی، ئەوان ئەمیـان نـەدی. گوێـی لێ بوو کچەکە بە کوڕەکـەی ئەوت: بۆچ ئەوەندە سەیرم ئەکەی؟ کوڕەکەش ئەیوت: «چاوەکەم هەرچی دنیایە و هەرچی لە دنیادا هەیە لەناو ئەو چاوە جوانانەتا ئەیبینم».

کوتوپڕ کابرا لێیان ڕاست بووەوە و وتی: «گووی تۆی لێ نەوارێ، ئا بزانە گاکەی من نابینی لە چاویا، دنیا نەما بۆی نەگەڕێم!».

٧٣. لـەو شـارەزوورە باران دایکردبـوو. کردبـووی بـە ڕەهێڵـە، هـەر خۆشی نەئەکردەوە. کابرایەك هەبوو مارفی ناو بوو، بەم بارانە زۆر تەنـگاو بـوو، هـەر ئەیـوت: ئەمە چییە هـەر نایوڕێتـەوە؟ یەکێکی‌تر لەوێ بوو وتی: مڵکی خۆیـەتی، چی لێ ئەکا لێی ئەکا.

مـارف وتـی: «برا، چـی مڵکی خۆیـەتی؛ کە هاوین هـات هەمووی ئەوێ وە مڵکی حامدبەگ و حەسـەن‌بەگ، کە زستان هات ئەوێتەوە وە مڵکی خوا!».

٧٤. حاجی سـەعیدی مەلا حەسەنی‌عەلاف وتی: لەگەڵ چەند کەسێکا چووین بۆ ئەو شارەزوورە لەو سەر ئاوی «موان»ـە دوو سێ کەسـی شـارەزووری ڕاکشابوون لەسـەر تەنیشت؛ هیچ گوێیان نەداینێ. وتی: منیش وتم: ئێستە ئەمانەتان بۆ ئەهێنمە جۆش.

وتی: وتم: ئەرێ برا کەس هەیە لەم ناوەدا پارەی لۆکە وەربگرێ؟ من شەش حەو هەزار دینارم هێناوە ئەمەوێ دایمەزرێنم بە سەلەمی لۆکە. وتی: یەکێ لە کابراکان تۆزێ قوت بووە و وتی: ها برا ئێژی چی؟ وتی: وتم: پارە بە لۆکە دائەمەزرێنم. وتی: ئەمجا کابرا تەواو ڕاست بووەوە وتی: «برا، با بچم دەنگ ئاوایی بدەم». هەر ئەمەی وت، ڕاست بووەوە وتی: کابرای هاوڕێ دەستی دایە پەلی وتی: خوا بتگرێ بۆ کوێ ئەچی گاڵتەت پێ ئەکا!.

٧٥. هەر حاجی سەعید گێڕایەوە وتی: جارێك «ڕەشە»ی دۆستم لەگەڵ کابرایەکی شارەزووریدا بووبوو بە دەمەقرەیان لەسەر حسابات و ڕەشە قسەی بە شارەزووری ئەوت. کابرای شارەزووریش وتی: «کاکە ڕەشی بۆچ قسە وە شارەزووری ئێژی؟ تۆ ئەوێ هەر مەمنوونی شارەزووری وی، هەتا چل ساڵی‌تری دوای خۆیشت ناوت لە قەید و قیوودی حوکمەتا هەر ئەمێنێ!».

٧٦. لەو سەرە ئافرەتێك هەبوو مناڵی نەئەبوو. هیچ شێخ و شەخس و مەلایەك نەما نەچێتە سەری، کەڵکی نەبوو. ڕۆژێك دەروێشێکی کەڵهوڕ بە پرچێکی درێژ و باوەشێ پشتێنی سەوزەوە لە پشتا و «جامِع‌الدَّعَوات»ێك لە بن دەستا، ئەچێتە ئەو دێیە بۆ دەروێشی و نوشتە کردنیش بە دەمیەوە. ژنەکە چووە لای و دەردەدڵی خۆی بۆ کرد. ئەویش دەمی «جامِعُ‌الدَّعَوات»ـەکەی بۆ کردەوە و تۆزێ سەری هێنا و برد و وتی: کتێبەکە شتێك ئەفەرموێ، لە ڕووم هەڵنایە بیڵێم! ئەگینا بەبێ شك مناڵت ئەبێ. ئەویش وتی: بەقوربانت بم! بڵێ قەیدی نییە. وتی: کتێبەکە ئەفەرموێ: ئەبێ نوشتەیەك بنووسم و ئەو نوشتەیە بە

ئالەتێکی تایبەتی ـ بلامانێ ـ لە شەرمتەوە بیکەم بەو دیوا. هەروەها لە سەرەکەشیەوە هەندێ شت هەیە ئەبێ بینووسم. ئافرەتەکە وتی: باشە بەقوربانت بم.

کابرا دەستی پێکرد؛ لەو کاتەدا خەریکی ئیش بوو ژنەکە وتی: «قوربان مادام عەزیەتەکەت کێشاوە، با کوڕ بێت!».

٧٧. ساڵێك لەو سەردەمەدا کە جۆش و خرۆشێکی کۆڕی ڕابواردن و دڵخۆشی و ئاهەنگ هەبوو لەناو مەلاکانی هەڵەبجەدا و هەموو بە یەکدڵی ڕایانئەبوارد، ئەیانویست بچن بۆ «هانەسوورە» بۆ زیارەتی سەید «عبدالرّحمن». ڕۆژیش ڕۆژی پێنجشەنبە ئەبێ، دیارە شەو و ڕۆژی جومعە لە هانەسوورە ئەمێننەوە. شێخ مستەفای موفتی هەڵەبجە ئەڵێ: بەخوا برا من لەبەر خوتبەی سبەینێ ناتوانم بێم. شێخ عەبدولکەریمی ئەحمەدبرِنە ئەڵێ: «بێقەزا بی شێخ مستەفا! خۆ خوتبەی جومعەی بزنی جوولەکە نییە هەر ئەبێ «مالووم» سەری ببڕێ! با یەکێکی‌تر ئەم خوتبەیە بخوێنێ؛ هەستە پێشمان کەوە سەفەرەکەمان لێ تێك مەدە».

٧٨. حاجی شێخ ئیبراهیم هەبوو، پیاوێکی مەلای نوورانی ڕیش‌سپی. ڕیشی ئەڕژایە سەر ناوکی. لە هەموو وڵاتی سوێسنایەتیدا بۆ مەلایەتی و دینداری ناوی دەرکردبوو. ڕۆژێ پیاوێك لە وڵاتی حەجا ئەچێتە لای پێی ئەڵێ: قوربان گوناحێکی گەورەم کردووە نازانم خوا لێم‌خۆش ئەبێ یان نە؟ ئەڵێ: چییە برا، خوا بەڕەحمە، غەیری شەریك دانان بۆ ئەو نەبێ، لە هەموو شتێکی‌تر خۆش ئەبێ. بیڵێ بزانم چییە؟ ئەڵێ: ئاخر قوربان وەڵڵا لە ڕووم هەڵنایە بیڵێم. ئەڵێ: کوڕم بیڵێ خوا غەفوور و ڕەحیمە. ئەڵێ:

«چووم بۆ ئەو خوارە شەیتان لە خشتەی بردم سەگێکم گا! ئەڵێ: جا چۆن نەیگەستی؟ ئەڵێ: قوربان ئاخر تۆپی‌بوو! ئەڵێ: جا تۆ ئیشی وات کرد؟ چۆن تەبیعەتت بردی و نەڕشایتەوە؟ ئەڵێ: قوربان ئاخر دنیا ڕەمەزان بوو! پاش نوێژی جومعە بوو! هیچم لە سکا نەمابوو. ئەڵێ: جا باشە نەترسای لەوە کە یەکێك بێت بە سەرتا و ئابڕووت بچێ؟ ئەڵێ: نەوەڵڵا قوربان، سووچێك بوو لە پاڵ دیواری کەعبەدا! کەسی بە سەرەوە نەبوو. حاجی شێخ ئیبراهیم بە سەبرێك دەست ئەبا ڕیشە سپییە نوورانییەکەی خۆی ئەگرێ و ئەڵێ: «ئەم ڕیشە وە قنگی ئەو سەگە تۆپیوە، ئەگەر خوا لێت‌خۆش ببێ، دە هەستە بڕۆ!»».

٧٩. لە زەمانی تورکا «قەشە»یەك لە «دیاربەکر» هەبوو. شەوێك لە نیوەشەوا یووزباشییەك لەوێ هەبوو «شەشە»ی ناو بوو، ئەچێ تەق تەق ئەدا لە دەروازەی کڵێسە. قەشە بە لەرزەلەرز دێت دەرگا ئەکاتەوە سەیر ئەکا ئەمە یووزباشییە، ئەوەندەی‌تر لەشی دێتە لەرزین. ئەڵێ: فەرموو وەرە ژوورەوە بزانم ئەمرت چییە؟ یووزباشی بە ڕوویەکی خۆشەوە ئەچێتە ژوورەوە و لە ژوورە بچکۆلەکەی قەشەدا دائەنیشێ، بەڵام قەشە دڵی لە ڕیشە سپییە جوانەکەی زیاتر ئەکەوێتە تەپەتەپ و جووڵانەوە.

یووزباشی ئەڵێ: هیچ دڵ لە دڵ مەدە، تۆ پیاوێکی ناوبانگی چاکەت لەم شارەدا بڵاو بووەتەوە. لە نەدیدە، هەر بەو ناوبانگتەوە من مەفتوونی خواناسی و پیاوخاسی تۆ بووم! کارەساتێك ڕووی داوە، من هەرچەندە سەر دێنم و سەر ئەبەم، تۆ نەبی ئەو شوێنە پڕ کەیتەوە، کەسی‌تر شایان و لایەق نییە؛ ئێستە هاتووم ئەو خەبەرەت بدەمێ و نابێ دەستیش بنی

بە ڕوومەوە؛ چونکە لێرەدا کاروباری گشتی وڵاتەکە وا پێویست ئەکا. قەشەی بەسەزمان ئەوەندەی‌تر ناوکی ئەکەوێ و ئەڵێ: فەرموو چی بێ بە من بکرێ و من درێغی بکەم، فەرموو بڵێ.

یووزباشی ئەڵێ: دوێنێ قازی ئەم شارە عەمری خوای کرد، ئێستە من لە تۆ چاکتر نابینم. والی دۆستمە، ئەچمە لای فەرمانت لە ئەستەموڵەوە بۆ وەرگرێت بۆ ئەوە ببی بە قازی ئەم شارە. قەشە هەر وا واقی وڕ ئەمێنێ! ئەڵێ: جەنابی یوزباشی من و قازیەتی موسڵمانان کوجا مەرحەبا؟ من لە کوێ و قازیەتی لە کوێ؟ یووزباشی ئەڵێ: ئەم قسانە ناچێ بە گوێما، ئەمە سوودی وڵاتەکەی تێدایە؛ ئەگەر نەیکەیت خەبەر ئەدەم بە والی و بە ئەستەموڵ کە تۆ لەم کڵێسەیەدا شەو و ڕۆژ خەڵك كۆ ئەکەیتەوە و بۆ زیانی خەلیفە ئیش ئەکەیت. قەشە دەستێکی ئەکەویتە ئەملا و دەستێکی ئەکەوێتە ئەولا، نازانێ چی بکا و چی بڵێ؟ لە ئەنجاما چارناچار ڕازی ئەبێ.

یووزباشی هەڵئەستێ لێ ئەدا ئەڕواتەوە. لە پاش دوو ڕۆژ جوبە و مێزەرێك ئەخاتە ناو سینییەك و تۆمارێکی ئەخاتە پاڵ و قەیفەیەکی سەوز ئەدەن بە سەریا و ئەیخەنە سەر سەری زەلامێك، بەشوێن ئەودا دەستەیەك تەپڵ و دەف لێ ئەدەن و زیکر ئەکەن. لە شوێن ئەوانەوە دەستەیەکی مووزیقاچی بە خۆیان و مووزیقاکانیانەوە بەڕێ ئەکەون و یووزباشیشیان لەگەڵایە. ئەم کۆمەڵە بەم جۆرە دێن بۆ بەر دەرکی کڵێسە و عالەمی‌تریش ئەکەونە شوێنیان.

قەشە دەرگایان بۆ ئەکاتەوە. یووزباشی لە پێشەوە ئەچێتە ژوورەوە. قەشە سەیری سینی و دەف و عالەم ئەکا سەری سڕ ئەمێنێ! ئەڵێ: ئەمانە چین؟ یووزباشی ئەڵێ: ئەو سینییە جوبە و مێزەرەکەی تێدایە

لەگەڵ فەرمانی خەلیفەدا کە تۆ بوویت بە قازی ئەم شارە. ئەڵێ: ئەم تەپڵ و دەفە چییە؟ ئەڵێ: لە پیرۆزی ئەوە کە تۆ جوبە و مێزەرەی قەزاوەت لەبەر ئەکەی، ئەمانە تەپڵ و دەف ئەکوتن و زیکر ئەکەن کە خوا قەزاوەتت لێ موبارەك کا.

ئەڵێ: ئەی ئەو مووزیقا و بەزمە چییە؟ پیاوێك بە نەشتەرێکەوە لە ناوەڕاستیانا وەستاوە؛ ئەڵێ: ئەوەش دەستەی خەتەنەسوورانن، ئاخر تۆ کە ئەبی بە قازی موسوڵمانان ئەبێ خەتەنە بکرێیت! ئەوە دەلاکە، ئەو خەتەنەت ئەکا و مووزیقاش لێ ئەدرێ بۆ شاییەکە و بۆ سەلامەتی سەری خەلیفە، کە تۆ خەتەنە کرایت و بوویت بە قازی وڵات و فەرمانت بۆ دەرچوو!.

قەشە هەروا ئەچێتە تاسەوە و ئەڵێ: جەنابی یووزباشی هەمووی قەبووڵ ئەکرێ، بەڵام خەتەنە کردنەکە من تازە لەم عومرەدا پێم قەبووڵ ناکرێ. ئێستە بۆم دەرکەوت کە مەسەلە چییە؟ هەموو پێنجسەد لیرە شك ئەبەم، ئەیدەمە خزمەتت و جەنابیشت ئیتر ئەمری خۆتە؟ یووزباشیش ئەڵێ: ئاخر فەرمانی شاهانە دەرکراوە چۆن ئەبێ؟ قەشە ئەڵێ: قوربان با فەرمان بۆ قەشە نەبێ بۆ شەشە بێ، جەنابت خەتەنەش کراوی هیچ ئەرکێکی تێدا نییە. یووزباشی ئەڵێ: باشە لەبەر خاتری تۆ بۆ ئەوەی تۆ تووشی عەزیەت نەبی، خۆم ئەیکەم بڵێم چی؟ پێنجسەد لیرە هەڵئەگرێ و بە خۆی و بە دەستەکەیەوە ئەگەڕێنەوە. تومەز ئەمە یووزباشی پارەی پێویست بوو وا ئەم کڵاوەی بۆ قەشە دروست کرد!.

٨٠. لە ئاوایی «بانگۆل» پیاوێك هەبوو سۆفی نادری ناو بوو، ژنێکی هەبوو «باجی فاتە»یان پێ ئەوت. باجی فاتە هەموو

جار ئەیوت: سۆفی فیشەکێ بتەقێنە. سۆفی دەستی کرد بە فیشەك تەقانن، ئەوەندەی فیشەك تەقان، هیچ هێزی تیا نەمابوو، هیچی پێ نەما. باجی فاتە دیسان ملی گرتەوە؛ سۆفی نادر نەیکردە نامەردی پشتی تێ هەڵکرد و دانیشتە سەر دوابڕاوەکەی باجی فاتە و تڕێکی ناقۆڵای پیا هێنا. باجی فاتە وتی: ئەوە چیت کرد؟ وتی: «لە جێی گشت کەسم، فیشەك تەواو بوو، تۆپێکم تێ گرت!».

٨١. کابرایەکی «گولە»ی «گوڵەك»ـی هەبوو لە پێنجوێن، کەڕ بوو خەڵکی ناویان نابوو «گزگل». کوڕێکی هەبوو ئەویش هەر کەڕ بوو، خەڵکەکە لەبەر باوکی بەویشیان ئەوت: «سیچکە». ڕۆژێك کابرا هەندێ گۆشت ئەکڕێ و ئەیباتەوە بۆ ماڵەوە، لە ڕێگادا تووشی کوڕەکەی ئەبێ پێی ئەڵێ: ئەوە ئەچیتەوە بۆ ماڵەوە؟ کوڕەکە ئەڵێ: نەوەڵڵا ئەچمەوە بۆ ماڵەوە. کابرای باوکی ئەڵێ: وامزانی ئەچێتەوە بۆ ماڵەوە ئەم گۆشتە بەریتەوە. کوڕە ئەڵێ: نەوەڵڵا بابە ئەچمەوە بۆ ماڵ دایکم، وتی: باوکت نەخۆشە کەوتووە لە ماڵەوە زوو وەرەوە. باوکی وتی: دە باشە کە ناچیتەوە بۆ ماڵەوە بچۆ بۆلای ناڵبەنەکە من خۆم گۆشتەکە ئەبەمەوە. کوڕەکە وتی: تۆ هەر تووڕە ئەبی، دایکم ڕەنگبێ ئێستە تەلیسەکەی تەواو کردبێ ئەیهێنم!.

٨٢. ئەحەی کرنوو وتی: جارێك خەوێکم دی، نیوەی ڕاست بوو نیوەی درۆ. وتیان: چۆن؟ وتی: «لە خەوما خەزنەیەکم دیوەتەوە و هەڵم گرتووە، لەبەر گرانی و قورسی خەزنەکە خۆمم پیس کردووە. کە خەبەرم بووەوە بەڵێ، ڕاست بوو گوم کردبوو بە خۆما، بەڵام هیچ خەزنە و مەزنە نەبوو!».

٨٣. ئەوا لە دیواخانەکەی شێخ حەبیبی تاڵەبانی لە کەرکووک دانیشتوون؛ کۆڕ گەرم بوو. قسە هاتە سەر ئەوە کە نێربازی باشە یا خراپە؟ مەلایەکیش لەوێ بوو ئەویش وتی: وەڵڵا بابم! لە کتێبا هەیە ئەفەرمووێ: ئەگەر یەکێ لە دنیادا سواری منالێك بێت، لەو دنیا ئەو منالە سواری سەر شانی کابرا ئەبێ و ئەبێ بەسەر پردی سیراتدا بیپەڕێنێتەوە. شێخ قادری سیامەنسووریش لە کۆڕەکە دانیشتبوو وتی: «جا ئەگەر وا بێ ئەبێ مامە شێخ حەبیبم لە کاتی پەڕینەوەدا بەسەر پردی سیراتدا وەکوو لۆری جەژنی لێ بێت!».

٨٤. دوو کابرا لەو شارباژێرە بۆ شار ئەهاتن. یەکێکیان لە پێشەوە بوو، هەر دەمی ئەجووڵا، ئەوی کەیان پێی وت: ئەوە چی ئەخۆی؟ وتی: مێوژ. وتی: دە بەشم بدە. وتی: «وەڵڵا مادام کردتە ئەو کارە و داتە ئەو دارەتەنە ئەبێ بەشت نەدەم. وتی: جا برا بۆچی چیم وتووە وا تووڕە ئەبی؟ وتی: چۆن چیم وتووە؟ تۆ چ ڕایەی ئەوەت ئەکەوێ بە من بڵێی: بەشم بدە!.

٨٥. شێخ مارفی سەعاتچی بۆی گێڕامەوە وتی: شێخ عەلی مەلا لە دێی چنارەی وارماوا هەبوو خزمایەتی لەگەڵ ئێمەشا هەبوو. خەتێکی خۆشی جوانی هەبوو. «سمایلنامە»یەکی نووسیبووەوە کەسی دەست نەکەوتبوو پیشانی بدا و ئافەرینی بۆ بکا؛ نیشانی دایکی دابوو. دایکیشی ئەیگرێ بە دەستەوە و زۆر بە دڵ سەیری ئەکا و ئەڵێ: «یارەبی ڕۆڵە دەستت خۆش بێ، چەند ڕێکوپێکە، ئەڵێی گوڵە تووتنە! پەنجەشی ئەکێشێ بۆ شوێنێکی و ئەڵێ: بەڵام ئا لەوێ دا "گڵمتك"ێکی تێدایە». شێخ عەلی وتی: کە سەیرم کرد لەو شوێنەدا ڕاست بوو، غەڵەتێك لە

نووسینەکەدا هەبووا. («گڵمتك» کەرسەکە).

٨٦. کابرایەك وتی: ئیمڕۆ دەستی کابرایەکم چاك بڕی. وتیان: ئەی بۆچی سەرت نەبڕی؟ وتی: ئاخر سەری بڕابووا.

٨٧. پیاوێکم لابوو «مامپیرداود»ی ناو بوو. ڕۆژێك قسە لە بەینی ژن و مێردەوە ئەکرا، ئەویش وتی: «بەخودای بابم، ئەگەر ژن، مێردی خۆی بوێ لە قنگی سەگیشا بێ شتی لۆ هەڵئەگرێ!».

٨٨. قانعی شاعیر لە سولەیمانی کردبوویان بە مامۆستای حەپسخانە کە بچێ دەرسی دین و چاکەکردن بە حەپسەکان بڵێ و فیکری خراپەکردن لە بارەی دینەوە لە سەریان لا بدا. کوڕێکی هەبوو «کوتەك»ـی ناو بوو. کوتەك پێی ئەڵێ: جا بابە تۆ بەو شێوەیە وەعز و نەسیحەتیان بکەی، ئیتر بەرەبەرە حەپسخانەکە چۆڵ ئەبێ و ئیتر تۆش نانت ئەبڕێ. ئەویش پێی ئەڵێ: «ڕۆڵە خەمت نەبێ، وایان لێ ئەکەم هەر لەگەڵ چوونە دەرەوە، خێرا پیاوێك بکوژن و بگەڕێنەوە بۆ حەپسخانە!».



# پەندی پیران

٨٩. لە قسەی گوێئاگردانی کوردانەیە ئەڵێ: سەگ کە ئەکەوێتە زستان لەو کوێستانە زۆری سەرما ئەبێ، بەفر و کڕێوە وای لێ ئەکا هێزی لێ‌ئەچنێ و شوێنێکی دەست ناکەوێ تیایا ستار بگرێ، ئەچێتە هەر لایەك بەفر و باران و سەرمایە. لە ئاخرا لە پاڵ دیوارێکا شوێنێکی پیس ئەدۆزێتەوە ـ کە ئەویش پێی ڕازی نابێ ـ لێی ئەکەوێ؛ کلکی دێنێتەوە بە دەور لمۆزیا و سەر ئەکا بە ناو گەڵی خۆیا. لە لایەکەوە باران ئەیکوتێ، لە لایەکەوە کڕێوە ئەدا بە بەینی تووکەکانیا و ئەیشەکێنێتەوە. بە کورتی: ئەو حاڵەی ئەو هەیەتی مەگەر هەر ئەو بیبێ. لەوێ کە لێ‌کەوتووە خەیاڵ ئەیباتەوە و دەست ئەکا بە بێزوو کردن ئەڵێ: «ئەمە حاڵە من هەمە؟ شەرت بێ ئەگەر کەوتمە هاوین هەرچی لەتك و پەتکی دنیایە کۆی کەمەوە بۆ زستان و لەم فەلاکەتە ڕزگارم بێ».

زستان بەسەر ئەچێ و ئەکەوێتە هاوین، وردەوردە گەرما دێت و ئەبووژێتەوە. ناکەوێتە چلەی هاوین و گەرما زۆری بۆ دێنێ. ئەمجارە ئەسووڕێتەوە بە شوێن چڵکاو و جۆگەلاوی پیس و بۆگەنا، بۆ ئەوەی خۆی تیایا بگەوزێنێ و فێنکی ببێتەوە. سەیر ئەکا ئەوەشی دەست ناکەوێ. بە پاڵ دیوارەکانا ئەڕوا، وەیا لێی ئەکەوێ بستێ زمانی دەرئەکێشێ و پەیتاپەیتا ئەیخاتەوە دەمی و دەری ئەکێشێتەوە.

جا لەو وەختەدا کە ئەو زمانبازییە ئەکا ئەڵێ: «کورە لەتکی چی و

پەتکی چی! لەتکی چی و پەتکی چی؟!».

٩٠. دیسان هەر لە قسەی کوردانەیە ئەڵێ: سەرەتا «چەقەڵ» لە ئاوەدانیدا بوو، «سەگ» لە چۆڵ و بیابانا. سەگەکان یەکێکیان لێ نەخۆش کەوت، هەرچەندە خەریك بوون چاك نەبووەوە؛ ئاخری قسەیان هاتە سەر ئەوە بچن پەنا بەرنە بەر چەقەڵەکان بەڵکوو ئەوان بێنە دەرەوە و ئەمان بچنە ئاوەدانی بە ماوەی چەند ڕۆژێك؛ بۆ ئەوەی ئەم سەگەیان نەختێ ئێسقان و وردەنانی دەست کەوێ بیخوا و چاك ببێتەوە و پاشان هەرکامیان بچنەوە شوێنی خۆیان.

لەسەر ئەم بڕیارە کۆمەڵیان کرد و بە گەل چوونە خزمەت چەقەڵەکان وتیان: وەرن پیاوەتییەکی وامان لەگەڵ بکەن: بە ماوەی چەند ڕۆژێك ڕێگەمان بدەن بێینە ئاوەدانییەوە و ئێوەش وەرنە دەرەوە بەڵکوو ئەم نەخۆشە هەژارەمان بەهۆی داودەرمانی ئاوەدانییەوە تۆزێ چاك ببێتەوە؛ پاشان دەرئەچین و ئێوەش ئەچنەوە شوێنی خۆتان. بەم ئیشەتان خێرێکی گەورە ئەکەن، نەفسێك لە مردن ڕزگار ئەکەن. چەقەڵەکان ڕازی بوون و چوونە دەرەوە و ئەوانیش هاتنە ئاوەدانییەوە.

ماوەیەکی زۆری پێ چوو، سەگەکان کە خەز و بەزی ئاوەدانییان چاوپێکەوت، دەرنەچوونەوە. چەقەڵەکان هاتن وتیان: ئەوە بۆچ دەرناچن و ئێمە بێینەوە شوێنەکەی خۆمان؟ ئەمانیش وتیان: هێشتا نەخۆشەکەمان چاك نەبۆتەوە. لەمان قسە و لەوان قسە، ئیتر لەو وەختەوە هەموو شەوێك چەقەڵەکان دێنە ڕۆخی ئاوەدانی دەست ئەکەن بە لوورە لوور و ئەڵێن: «نەخۆشەکەتان چاك نەبۆتەوە؟» سەگەکانیش دەست ئەکەن بە حەپەحەپ ئەڵێن: «حەو ڕۆژیتر حەو ڕۆژیتر!».

٩١. ئەڵێ: بە مشکیان وت: تۆ جانەوەرێکیت هاوتات نییە لە ئازاییدا: جەواڵ ئەدڕی، دار کون ئەکەی، زەوی هەڵئەدڕی، ئەمانە هەموو بۆ تۆزێ ڕزقی قوزەڵقورت کە بەردەستت کەوێ. ئێستە ئەمانە هیچی مەکە، ئا ئەو پشیلەیە -کە چاوت لێیە- دوو بست لێتەوە دوور نییە، بچۆ موویەك لە سمێڵی بکەرەوە و ئەمە حەو بار گەنمە لە بری، بۆ خۆت وەری بگرە تا ماویت پێوە ئەژیت و ئیتر بۆ کوێرەوەری ژیان تووشی هیچ دەردیسەرێکیتر نابیت.

مشکەکە تۆزێ ڕاما و پاشان سەری بەرز کردەوە وتی: «بەڕاستی کرێیەکە کرێی چاکە، بەڵام ڕێگەکەی زۆر بڤەیە!».

٩٢. لە قسەی کوردانەیە ئەڵێ: «ڕێوی»ـیەکی کوێستان تووشی ڕێوییەکی گەرمیان بوو، لێی پرسی: ئەوە تۆ لەو گەرمیانە چی ئەخۆی؟ وتی: مۆز ئەخۆم، پرتەقاڵ ئەخۆم، خورما ئەخۆم، نارنج ئەخۆم، هەر شتێك خۆش بێ ئەوە ئەخۆم.

ئەمجا ڕێوی گەرمیان لە هی کوێستانی پرسی: ئەی تۆ لە وڵاتی خۆتان چی ئەخۆی؟ وتی: «ئاگات لێ نییە من شەکرە، شەکرە، شەکرە، شەکرە، شەکرە، شەکرە، شەکرە، شەکرە، شەکرە، شەکرە بەڕوو ئەخۆم». ئەڵێ: ڕێوی گەرمیان ئاو زاییە دەمی و لە تاوانا سوێی بووەوە مردار بووەوە!.

٩٣. پادشایەك تووشی نەخۆشی بووبوو، بە هیچ چار نەئەکرا. لە ئەنجاما پێیان وت: کراسی پیاوێکی بەختیار لەبەر کەی لە نەخۆشییەکەت ڕزگارت ئەبێ.

ئەویش هەستا کەوتە وڵاتان بۆ دۆزینەوەی پیاوێکی بەختیار؛ هەر دەستی نەکەوت، هەتا ڕۆژێك لە دەشتێکا سەیر ئەکا وا کابرایەکی شوان

لەسەر شاخێك بەلای مەڕەکانیەوە دانیشتووە، گالۆکەکەی کردووە بە مەچەکیا و «بلوێر» لێ ئەدا بۆ مەڕەکانی. دنیای بەلاوە وەکوو «کا» و «با» وایە.

پادشا وتی: بەختیار ئەگەر ببێ ئەمەیە. هەستا چوو بەلایەوە لێی پرسی: مامە شوانە، کەس شك ئەبەی لە خۆت بەختیارتر و کامەرانتر بێ؟

وتی: ئەگەر بەختیار هەبێ هەر منم. وتی: کەواتە کراسەکەتم بەرێ لەبەری کەم. وتی: «جا ئەگەر کراسم هەبوایە، لە کوێ بەختیار ئەبووم!».

٩٤. کابرایەك لەو دەشتە سەیری کرد وا کەللەسەرێك کەوتووە و هەر هەڵئەخاتەوە ئەڵێ: «ئەگەر زمان بوەستێ سەر سەلامەتە».

ئەمەی بەلاوە زۆر سەیر بوو، کە گەڕایەوە ناو شار وتی: کوڕینە! من ئیمڕۆ لەو دەشتە شتێکی سەیرم چاوپێکەوت. تەماشا ئەکەم کەللەسەرێکی بێ لەشی ئادەمیزاد هەر هەڵئەخاتەوە و ئەڵێ: «ئەگەر زمان بوەستێ سەر سەلامەتە».

وتیان: کورە شتی وا چۆن ئەبێ؟ خەبەر گەیشت بە پادشا و پادشا ناردی بەشوێنیا و لێی پرسی. کابرا لای ئەویش بەو جۆرە گێڕایەوە. پادشا وتی: ئەگەر وا نەبوو چۆن؟ وتی: ئەوا کەللەسەرەکە لەو دەشتە کەوتووە با بچین، ئەگەر وا نەبوو لە سەرم بدە.

پیاوی خستە تەکی و چوون. کە ڕۆیشتن سەیر ئەکەن بەڵێ، کەللەسەرێکی ئادەمیزاد بەبێ لەش کەوتووە، بەڵام ئەم قسە و شتە ناکا. ئەمجا لە کابرا ئاڵان وتیان: خاوەنی ئەم سەرە تۆ کوشتوتە ئەبێ بکوژرێیتەوە لەباتی. هەرچەندە هاواری کرد، هیچ دادێکی نەگەیاند. بە فەرمانی پادشا دایان لە سەری کابرا و سەریان پەڕان.

پاش ئەوە کە کابرایان سەر بڕی، کەللەسەرەکە کەوتەوە هەڵخستنەوە و دەستی پێ‌کردەوە: «ئەگەر زمان بوەستێ سەر سەلامەتە!».

**٩٥.** لە «نەزانی»یان پرسی: کەسوکار و عەشیرەتت کێیە؟ وتی: من خۆم ناوم شەڕە، باوکم ناوی جەورە و دایکم ناوی گوناح؛ براکەم زۆرداری، خوشکەکەم دووبەرەکی، حەسادەت مامە و زەبوونی خاڵمە؛ هەژاری کورمە و تەمەڵی و بێ‌کارەیی کچمە؛ وێرانە و وێرانی نیشتمانمە و خزم و کەسوکاریشم دیلی و ژێردەستەیی و پیشەم خزمەت‌کردنی دوژمن و سەرمایەشم دەرد و ئازارە؛ هاتوچۆ کردنم کوشتن و بڕینە و ماڵیشم تاریکییە؛ خۆراکم پاشماوەی خەڵکە و خەوم بێ‌هۆشییە؛ بێداریم مردن، ڕۆژم ڕەشی، شەوم بەندییە؛ دراو و پارەم کیسەی ستەمکارانە، ئەگەر بمداتێ پیاوێکی نان بدە و سەخییە، ئەگەر نەشی دا پیاوێکی عادڵ و بە دادە؛ دیارە منیش بەندەی ئەو کەسانەم!.

**٩٦.** ئەڵێ: ساڵێك لە «قرژاڵ»ـیان پرسی: ئەوە تۆ چۆن دوو سەر و چوار چاو و دوو دەمت هەیە؟ بە هەردوو بارا ئەچی بە ڕێگادا و لە هەردوو سەریشەوە گاز ئەگریت؟ وتی: «برا ئەوە ئێوە نایزانن، من لێم دێت ئێوە لێتان نایە. من پێم ئەکەوێ ئێوە پێتان ناکەوێ!».

**٩٧.** ئەڵێ: سەگ کە ڕوو ئەکاتە گورگ، ئەوەڕێ و ئەترێ. لێیان پرسی: وەڕینت لە چی و ترینت بۆچی؟ وتی: «کە ئەوەڕم گورگ ئەترسێنم، کە ئەترم خۆم ئەترسم!».

**٩٨.** ئەڵێ: جارێك گورگ وتی: تۆبە ئەکەم و ئیتر بەسە ئەم دڕەندەیی و ئازار گەیاندنە بە خەڵك، با ڕێگەی حەج بگرمە

بەر و پاش حەجەکە لە گۆشەیەك بۆ خۆم دانیشم خەریکی خواپەرەستی بم، تا خوا ئەم ئەمانەتەم لێ وەرئەگرێتەوە.

لێی دا وردە وردە بەڕێ کەوت و ڕۆیشت. برسیەتی ڕۆژبەڕۆژ بێ هێزتری ئەکا، وای لێ هات لاکەی ئەهات لە برسانا.

ڕۆژێك لە دوورەوە ئێسترە گەڕێکی بەرچاو کەوت کە بەرەڵا کرابوو. وتی: خوا لە وەختی تەنگوچەڵەمەدا حەرامی حەڵاڵ کردووە؛ من ئەوەتا لە برسانا ئەمرم، با تۆبەشم کردبێ و بۆ حەجیش بچم، بۆم حەڵاڵە بچم ئەم ئێسترە بخۆم. چونکە ئەگەر نەیخۆم ئەمرم و پەکی عیبادەت و خواناسییەکەم ئەکەوێ.

چوو بەلای ئێسترە کەوتووەکەوە و خۆی لێ خۆش کرد. ئێستر پێی وت: مام گورگ ئەوە ئۆغر بێ؟ وا لەم دەشتەدا وردەوردە ئەڕۆیت و هاتوویت بەلای منەوە؟ وتی: وەڵڵا ئۆغرت خێر بێ! ئەمەوێ بچم بۆ حەج، بەڵام زۆرم برسی بوو، بە شەرع بۆم حەڵاڵە تۆ بخۆم و هاتووم بتخۆم و پاشان بڕۆم.

ئێستر وتی: یاخوا بەخێر بیت و خوا حەجت قەبووڵ بکا! بەڕاستی منیش لەم ژیانە وەڕز بووم، ئەمەوێ ڕزگار بیم، بەڵام مام گورگ خۆت ئەزانی گەلێ حەدیس و ئایەت لەسەر ئەوە هەیە کە ئەگەر گیاندارێك سەر بڕا بە جۆرێك سەری ببڕن کە زوو گیانی دەرچێ، ئێستە منیش وەختی خۆی کە ناڵ کراوم، بزمارێك لە وەختی ناڵەکەدا چووە بە گۆشتەکەدا زۆر ئازارم ئەدا، تۆ لەولاوە بمخۆی و لەم‌لاشەوە ئەو ئازارەم هەبێ، ئەمە پێچەوانەی ئەو خواناسییەیە کە تۆ گرتووتە بەر. ئەگەر بە زەحمەتی نەزانی لە پێشا ئەو بزمارە دەربێنی و پاشان بە شێنەیی بمخۆی، زۆر خێرت ئەگا!.

مام گورگ وتی: ڕاست ئەکەی، کامەتا؟ تا بۆت دەربێنم. ئێستر قاچی بەرز کردەوە پیشانی دا، مام گورگ بە وەستایی لمۆزی بۆ درێژ کرد کە دەری بێنێ، لەو کاتەدا ئێسترەکە لەقەیەکی ماڵی بە دەم و لمۆزی گورگەکەدا، هەموو دانەکانی کەوتنە خوارەوە و لەوێ بەبێ هۆشی کەوت و ئێستریش لێی دا ڕۆیشت.

پاشان کە هاتەوە هۆش خۆی و سەیری حاڵوباڵی خۆی کرد، ڕووی کردە خۆی و بە خۆی وت: «ئاخر خوا بتگرێ گورگ، تۆ باوکت ناڵبەند بوو! باپیرت ناڵبەند بوو! تۆ چی و ناڵبەندی چی؟ دە بیخۆ ئەوە دەردت بێ!».

**٩٩.** ئەڵێ: لەو وڵاتە لە بێشەیەکا شێرێکی لێ بوو، هەموو گیانلەبەر و دڕەندەکان لێی ئەترسان؛ بەتایبەتی دەستەی «چەقەڵ» زراویان لێی چووبوو. ڕۆژێ ئەم چەقەڵانە کۆ بوونەوە کە بەڵکوو چارێك بۆ خۆیان بدۆزنەوە و لە دەست ئەم شێرە ڕزگاریان ببێ.

چەقەڵێکی زۆر پیری کۆنەساڵ هەبوو وتی: چاری ئاسانە! ئەگەر ئێوە بتوانن ئەوەی من ئەیڵێم بیکەن. وتیان: فەرموو هەر شتێك بڵێیت ئەیکەین. وتی: من ئەمە چەند ساڵە تووکی کلکم هەر هەڵوەریوە و لە کونەکەما ماوەتەوە. پەنا بەرنە بەر «گۆرەویلە» ئەو تووکەتان بۆ بڕێسێ و بیهێننەوە، من لەسەر ڕێگەی شێرەکەدا ئەیکەم بە داو و بۆی ئەنێمەوە، پێوە ئەبێ و ئەو وەختە هەموومان ڕزگارمان ئەبێ لە دەستی!.

ئەمجا وەکوو ئەو وتی، وایان کرد و بۆیان کرد بە بەن و گوریس و ئەویش چوو لە ڕێگەی شێرەکەدا داوێکی نایەوە. شێرەکە بە نەڕەنەڕ و گرمەگرم بەوێدا تێپەڕی و هەردوو دەستی لە ناکاو بوو بە داوەکەوە.

نەختێ هێزی دایە خۆی و ویستی گوڕ بەستێتەوە بۆ پچڕینی، کەچی هەردوو قاچیشی پێوە بوو؛ ئیتر بە جارێ پرزەی لێ بڕا و ڕۆژبەڕۆژ هەتا ئەهات لاوازتر و بێهێزتر ئەبوو؛ گیانێکی تیا مابوو یا نەمابوو.

ڕۆژێـک مشـکێك بەوێـدا تێپەڕی سـەیری شـێرەکەی کرد. شێرەی بەو جۆرە دی سەری سڕ ما و چوو بەلایەوە وتی: ها شای گیانلەبەران! خێرە وا بەم جۆرە لێرەدا کەوتووی؟ وتی: بڵێم چی؟ ئەمەیە کە ئەمبینی، بەسراومەتەوە و پەلوپۆم بڕاوە. مشکە وتی: ئاسانە، ئەگەر بفەرمووی من هەر ئێستە ڕزگارت ئەکەم. شێرە وتی: جا چی لەوە چاکتر هەیە؟

مشك تێکەوت، ئەوەندەی «کەفرەکونێ» هەموو کەمەندی داوەکەی خێرا بە ددان قرتان و شـێرە ڕزگاری بوو. شـێر هەسـتایەوە و خۆی تەکان و لێی دا ڕۆیشت و ماڵاوایی لە مشك کرد.

مشـکەکە کـە سـەیری کـرد شـێرەکە ملـی ڕێـگەیەکـی گرتـووە کە ئەو ڕێگەیە لە بێشەکە دەرئەچێ. کەوتە شوێنی و پێی وت: شای دڕەندەکان! ئەوە بۆ کوێ ئۆغر ئەکەی؟ وتی: وەڵڵا لەم بێشەیە ئەچمە دەرەوە و ئەم شـوێنە بەجـێ دێڵـم. وتـی: ئاخر تۆ چۆن ئەم شـوێنە بەجـێ دێڵی؟ ئەم جێگایـە نیشـتمان و وڵاتـی خـۆت و باوباپیـرت بـووە، ئێسـتە چۆن دڵـت دێـت بەجێـی بێڵی؟ شـێرە وتی: «وازم لێ بێنـە گوو ئەکەمە ئەو وڵات و نیشتمانە کە چەقەڵ بمگرێت و مشك بەڕەڵام کا!».

١٠٠. ئەڵـێ: کابرایـەك لـەو بـەر کێـوە چەنـد مریشـکێك ئەخاتـە سەبەتەیەکەوە ئەیبا بۆ شار بیفرۆشێ؛ ئەیخاتە سەر گوێدرێژێك و بەڕێ ئەکەوێ. ئەگاتە پێچەکانی «تەلان»، سەیر ئەکا وا ڕێوییەکی تۆپیو ڕاسـت لە چەقی ڕێگەکەدا کەوتووە. نووکە شـەقێکی لێ ئەدا و گوێـی

ناداتێ ئەڕوا؛ مەگەر ئەم ڕێوییە نەتۆپیوە! بە فێڵ وای لە خۆی کردووە.

کابرا زۆر ناڕوا، ئەگاتە پێچێکی‌تر، تا ئەو ئەگاتە ئەوێ، ڕێوی بە قەڵەمبازێك لە کلکەی لووتکەکەوە خۆی ئەگەیەنێتە بەردەمی، لەوێشا خۆی ئەکا بە تۆپیو. کابرا کە سەیری ئەمەش ئەکا پەشیمان ئەبێتەوە بۆ ئەوی‌کە کە بۆچی هەڵی‌نەگرتووە لەگەڵ ئەمەدا ئەبێ بە دوو ڕێوی و ئەیبا لە شار پێستەکەیان ئەفرۆشێ، پارەیەکی چاك ئەکا.

وڵاغ و مریشکەکان لەوێ بەجێ دێڵی و ئەگەڕێتەوە بۆ ڕێوییەکەی‌تر. هەر کە ئەو پشت هەڵئەکا ڕێوی ڕاست ئەبێتەوە ئەنیشێتە ناو مریشکەکان، قیژوهۆڕ ملی چەند مریشکێك ئەشکێنێ و ئەیانبا.

کابرا کە ئەچێتە سەروەخت ڕێوییەکەی‌ترەوە، سەیر ئەکا ڕێوی نەماوە. ئەگەڕێتەوە دواوە، تەماشا ئەکا ئەم ڕێوییەکەی‌تریش نەماوە؟

دەست لە گونان بەرەوژێرتر ئەچێ بەلای مریشکەکانیەوە تەماشا ئەکا مریشکەکانیش چەند دانەیەکیان نەماون. ئەمجا تێ ئەگا کە ئەم ڕێوییە قوماربازە فێڵی لێ کردووە!.

١٠١. کابرایەك «مامش»ـی هەبوو «مام‌وسوو»ی ناو بوو. کیژێکی زۆر جوانی هەبوو، هەرکەس ئەهات نەیئەدایە، ئەیوت: من ئەم کیژەم نە بە ژنی ئەدەم نە بە ماڵی دنیای ئەدەم. پرسیارێکم هەیە، هەرکەس وەڵامم بداتەوە، ئەیدەم بەو کەسە. پرسیارەکەش ئەوەبوو ئەیوت: «ئاو کاتێ کە ئەیکەنە مەنجەڵ و ئەیخەنە سەر ئاگر، دەست ئەکا بە قوڵتەقوڵت و کزەکز ئەڵێ چی؟»

هەرکەس کە ئەهات داوای کچەکەی ئەکرد ئەم پرسیارەی لێ ئەکرد، ئەویش نەیئەزانی وەڵام بداتەوە بۆ خۆی ئەچووە دواوە.

هەر لەو دەورە لە گوندی «سیساوێ» پیاوێکی تر هەبوو «مام هۆمەر»ی ناو بوو، کوڕێکی هەبوو «پیرۆت»ی ناو بوو. پیرۆت زۆر لاوچاك بوو، دڵی لە کچی مام وسوو سەندبوو، ئەویش دڵی بە کچەوە بوو بەڵام نەیئەتوانی بچێ داوای بکا، چونکە وەڵامی پرسیارەکەی نەئەزانی. ڕۆژێك چووە بن دەستی کچەکەوە پێی وت: ئەگەر تۆ منت ئەوێ، بەڵکوو ئیشێکی وا بکەی ئەو وەڵامە بە باوکت دەربخەی و بە من بڵێیت. کچەکە وتی: باشە. کچە دەستی کرد بە خزمەتکردنی باوکی. خزمەتێکی وا کە بە جارێ دڵی باوکی سەند و باوکی هەموو جار دوعای خێری بۆ ئەکرد. ڕۆژێك کچەکە وتی: بابە ئەگەر تۆ منت خۆش ئەوێ ئەو وەڵامە چییە وا هەرکەس دێت داوای من ئەکا و تۆ پرسیارێکی لێ ئەکەی و ئەو نازانێ وەڵام بداتەوە. باوکە وتی: کچم لەوە گەڕێ، داوای هەر شتێکی تر ئەکەی بکە، داوای ئەوە مەکە.

کچە ماوەیەك لێ‌گەڕا و دیسان هەمان داوای لێ‌کردەوە تا لە ئەنجاما پێی دەرخست وتی: «کچم ئەوە ئەو ئاوە ئەڵێ: هەر شتێ کە کردم خۆم بە خۆمم کرد؛ ئەگەر من نەچوومایە ئاوی ئەو خەڵفە دارانەم نەدایە، وا بەو جۆرە گەورە نەئەبوون و پاشان نەئەهاتن بین بە ئاگر و کسپە لە جەرگمەوە بێنن!».

کچە چوو ئەم وەڵامەی بە پیرۆتی دەزگیرانی وت. لە پاش ماوەیەك پیرۆت بە باوکی وت: کە بچێت داوای کیژەی لە مام وسوو بۆ بکا. باوکی وتی: جا ڕۆڵە مام وسوو دیارە کیژ بە کێ ئەدا؛ بەو کەسەی ئەدا کە وەڵامی پرسیاری بداتەوە، وتی: تۆ بچۆ ئەگەر ئەو مەرجەی گرت بڵێ: کوڕەکەم وەڵامت ئەداتەوە.

بە ناچاری مام هۆمەر چووە لای مام وسوو وتی: ئەبێ پیرۆتی کوڕم

بکەی بە کوڕی خۆت. مام وسوویش وتی: مام هۆمەر تۆ خۆت ئەزانی من تەمای دنیام نییە، کچ بەو کەسە ئەدەم کە وەڵامی پرسیارەکەم بداتەوە. مام هۆمەر وتی: پیرۆت دێت پرسیاری خۆتی لێ بکە، ئەگەر وەڵامی دایتەوە کیژەکەی بدەرێ، ئەگەر نەیدایتەوە هیچ. مام وسوو وتی: باشە.

مام هۆمەر پیرۆتی کوڕی نارد. مام وسوو وتی: «ڕۆڵە تۆ کیژی منت ئەوێ ئەبێ وەڵامی پرسیارم بدەیتەوە»، پیرۆتیش وتی: مام وسوو پرسیار بکە. مام وسوو وتی: «ڕۆڵە ئاو کاتێ کە ئەیکەنە مەنجەڵ و ئەیخەنە سەر ئاگر دەست ئەکا بە قوڵتەقوڵت و کزەکز، ئەوە ئەڵێ چی؟» پیرۆت وتی: «مامە ئەوە ئەڵێ: هەر شتێ کە کردم خۆم بە خۆمم کرد؛ ئەگەر من نەچوومایە ئاوی ئەو خەڵفە دارانەم نەدایە، وا بەو جۆرە گەورە نەئەبوون و پاشان نەئەهاتن ببن بە ئاگر و کسپە لە جەرگمەوە بێنن!)».

مام وسوو کە ئەمەی گوێ لێ بوو وتی: «هەر شتێ کە کردم خۆم بە خۆمم کرد، ئەگەر من بە کیژەکەم نەوتایە و ئەو بە تۆی نەوتایە وا ئێستە کیژەکەم لە دەست نەئەبووەوە!)». ناردی مەلایان هێنا و کچەکەیان لە پیرۆت مارە کرد!.

١٠٢. لە قسەی گوێئاگردانی کوردانەیە ئەڵێ: بینایی‌چاوان عینسان و سەگ و کەر و مەیموونی کۆ کردەوە وتی: عومرتان ئەدەمێ یەکی چەندتان ئەوێ؟ وتیان: بینایی‌چاوان کەیفی خۆتە چەندمان ئەدەیتێ، بە زیاد بێ. ڕووی کردە عینسان فەرمووی: سی ساڵ باشە؟ عەرزی کرد: کەیفی خۆتە بە زیاد بێ.

ڕووی کردە سەگ وتی: بۆ تۆیش سی ساڵ بەسە؟ سەگ عەرزی کرد: بینایی‌چاوان سی ساڵ بۆ من زۆرە، لە توانامدا نییە سی ساڵ پاس

و حەپەحەپ بکەم؛ دە ساڵم بەسە بینایی چاوان. ڕووی کردە ئەوانی‌تر فەرمووی: کێ بیست ساڵەکەی تر هەڵئەگرێ؟ عینسان دەستی دا بە سنگیا و وتی من.

ئەمجا ڕووی کردە کەز و فەرمووی: تۆش سی ساڵت بەسە؟ عەرزی کرد: بینایی‌چاوان من لە کوێ توانای ئەوەم هەیە سی ساڵ پشتم لە ژێر بارا بێت؟ منیش دە ساڵم بەسە. ڕووی کردە ئەوانی‌تر فەرمووی: کێتان بیست ساڵەکەیتان ئەوێ؟ هەر گورج عینسان هاتە زمان وتی: بینایی‌چاوان خۆم.

پاش ئەوە ڕووی کردە مەیموون و فەرمووی: ئەی تۆ سی ساڵت بەس نییە؟ عەرزی کرد: بینایی‌چاوان سەر و فەساڵێکی زۆر جوانت نەداومەتێ تا دڵم بە خۆم خۆش بێ! هەرکە چاوی پێم ئەکەوێ پێم ئەکەنێ؛ کەواتە هەر دە ساڵ ئەتوانم ببم بە ڕیشخەنگای مەردم. بە زیاد بێ لەوە زیاترم ناوێ.

ئەمجا بەبێ ئەوە لە ئادەمیزاد بپرسێ یا نەپرسێ، هەر خێرا عینسان هاتە قسە و عەرزی کرد: بینایی‌چاوان بیست ساڵە زیادەکەی ئەویش هەر بدە بە من!. بینایی‌چاوان ئەو بیست ساڵەی مەیموونیشی دایە. ئەوا بەم جۆرە ئادەمیزاد نەوەد ساڵێ عومری پەیدا کرد، بەڵام چۆن نەوەد ساڵێك؟:

نەوەد ساڵێ کە وا سی ساڵی هی خۆی بووە و لەو سی ساڵەدا وەکوو نوستوو وایە. لە سییەوە تا پەنجا ئەو بیست ساڵەی هەر خەریکی هەڵپە کردنە و بەم‌لاوبەولادا پەلامار ئەدا بۆ شت پەیدا کردن و بۆ پاس کردن. لە پەنجاوە تا حەفتا ئەو بیست ساڵەشی وای لێ دێ ئەبێ بە ژێر باری ماڵ و مناڵ و ئەرکی بەڕێوە بردنی ئەوانەوە. لە حەفتاوە تا نەوەد ئەو

بیست ساڵەش کە هی مەیموونەکەیە و وەری‌گرتووە؛ لەبەر ئەوە کە لەشولاری تێك ئەچێ و دەموچاوی چرچ و لۆچی تێ ئەکەوێ و پشتی کۆم ئەبێتەوە و هیچی بەسەر هیچەوە نامێنێ. وەکوو مەیموونەکە ئەبێ بە ڕیشخەنگای خەڵك. جا برام تۆ تەماشای خۆت بکە بزانە ئێستە [تەمەنی] کامیەك لەو گێجانەت وەرگرتووە؟.

١٠٣. لە قسەی گوێئاگردانی کوردانەیە ئەڵێ: کابرایەك هەبوو لەو سەرەگەلێ قسە و زمانی ئەزانی. یەکێکی‌تریش هەبوو هیچی نەئەزانی. نەزانەکە چووە لای زاناکە پێی وت: قسەیەکم فێر کە. ئەویش وتی: نازانم. وتی: پیاوەتیت بێ، تۆ فرە ئەزانی شتێکم فێر کە. وتی: من بە خۆڕایی شت فێری کەس ناکەم. وتی: چیت ئەوێ، ئەتدەمێ قسەیەکم فێر کە. وتی: باشە، قسەیەکت فێر ئەکەم بە گانێك!. وتی: پیاوەتیت ببێ شتی وا چۆن ئەبێ؟ وتی: هەر ئەوەیە؛ ناچار کابرا ڕازی بوو، ئەویش پێوە نیشت و لێ بووەوە. وتی: دەی قسەیەکم فێر کە. وتی: «بڕۆ هەتا ماوی بڵێ: ئای قنگم!».

١٠٤. هەر لە قسەی گوێئاگردانی کوردییە کە زیندەوەری‌تر قسەی هەیە ئەڵێ: لەو دەشتی لاجانە حوشترێك لێ کەوتبوو، چووبووە دەریای ئەندێشە و کاوێژەوە. لە دواوە کۆمی وەکوو لاشە گۆشتێکی زلی سوور دەرپەڕیبوو. ڕێوییەك بەو ناوەدا تێ‌پەڕی، سەیری کرد وا ئەم لاشە گۆشتە سوورە جوانە لەو دەشتەدا بەبێ خاوەن کەوتووە!. سووری کۆگا گۆشت، حوشترەکەی نەهێنایە بەر چاوی. چوو پەلاماری دا و چەمۆڵەی بۆ درێژ کرد. هەر کە چەمۆڵەی گەیشت بە قنگی حوشتر، حوشتر ڕاچەنی و ڕاست بووەوە. دەستی ڕێوی ترنجایە ناو قنگی حوشتر

و خۆیشی بە دوای حوشترەکەدا شۆڕ بووە و دەستی کرد بە ڕۆیشتن.

لەو کاتەدا چەقەڵێك بە لایانا تێئەپەڕی، سەیری ڕێوییەکەی کرد، ئەم دیمەنەی بە لاوە سەیر بوو وتی: ها مام ڕێوی خێرە ئەمە چییە؟ بۆچ وات لێ هاتووە؟ وتی: قوربان خزمەتکاری ئەم نەجیمەین و لە پشتیەوە ئەڕۆین. وتی: جا ئێستە چاوەڕێی چیت؟ وتی: هیچ؛ چاوەڕێی ترپێکی ئەم خاس خوایەین!».

١٠٥. لە قسەی گوێئاگردانی کوردییە ئەڵێ: جارێك مشکەکان کۆ بوونەوە و وتیان: ئەمە چ حاڵێکە ئێمە هەمانە بە دەست پشیلەوە؟ ئەگەر ئێمە هەزارێك بین، هەر لەگەڵ پشیلەیەکمان لێ پەیدا بوو، بەولاوبەملادا لالۆپاڵ لێمان ئەخا و هیچمان لەگەڵی پێ ناکرێ؛ با ئیشێکی وا بکەین بەڵکوو تۆزێ لە خەمی ڕزگار ببین. لەو ڕووەوە هەر یەکەیان قسەیەکی ئەکرد و هەرکەسەیان ڕاوێژێکی ئەکرد. لە ئەنجاما هاتنە سەر ئەوە وتیان: بێنین زەنگێك بکەینە مل پشیلە، هەر کە جووڵایەوە و ویستی بێت بە لامانا زەنگەکە دەنگی دێت و ئەو وەختە هەریەکە بە لایەکا ڕا ئەکەین. هەموو ئەو قسەیەیان پەسند کرد و وتیان: قسەی چاکە و لەسەر ئەمە بڕیاریان دا و وتیان: ئیتر لە بەڵای پشیلە بێوەی ئەبین. لەسەر ئەمە مانەوە، تەنها مایەوە سەر ئەوە کە کێ بچێت ئەم زەنگە بکاتە مل پشیلە. کە گەیشتە ئێرە، هەموو ئاشبەتاڵیان لێ کرد و بڵاو بوونەوە.

١٠٦. ئەڵێ: کابرایەکی گولەکەی بێفەڕە لەو وڵاتی «شنۆ»یە بۆی لوا بوو خۆی کردبوو بە «پاشاپیشۆك»ـی ئەو وڵاتە؛ نە کەس هەبوو قسە لە ڕوویا بکا نە کەس ئەیوێرا پێی بڵێ: لای چاوت کلی

پێوەیە؛ بە کورتی: بکوژ و ببڕ هەر بووبوو بە خۆی. ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە ئەو خەڵکە وایان ئەزانی ئەمە لەلایەن خواوە هاتووە و هەموو کەس ئەبێ ملی بۆ دانەوێنێ.

ڕۆژێ لە ڕۆژان پیاوێکی «بێتووشی»ئەچێتە ئەوێ بە ناوبانگی ئەم کابرایەوە؛ تەماشا دەکا ئەم کابرایە کابرا گولەکەی وڵاتی ئەوانە وا لێرە بووە بە قەشەم شا. لێی ئەکا بە هەرا و بە خەڵکەکە ئەڵێ: کە ئەمە هیچ نییە و لەلای ئێمە شیاکەشی پێ ناڕێژن. ئەمجا دەری ئەکەن و هەر شتێکی دەست کەوتبوو ئەوەشی لێ ئەستێننەوە. بەڵام کابرا کە زانی ئەگەر لەسەری بڕوا خراپتر ئەبێ، شڕوشاتاڵی خۆی پێچایەوە و وتی: «تا کە هاتم بوو، هەر هاتهاتم بوو، ئێستە نەهاتمە قسەی بێتووشی بۆ نەهاتم بوو!»



# گەنجی درەخشان

١٠٧. کابرایەك هەبوو «حاجیاڵی» ناو بوو. خەڵکی ئەو وڵاتی باڵەکایەتییە بوو. هەژار کەوتبوو بە هەژاری کەوتبووە سابڵاغ. بە ئێواران ئەچوو لە مزگەوتەکانا دەستەسڕێکی ڕائەخست و بە دیاریەوە دائەنیشت بۆ ئەوەی شتێکی بۆ بخەنە سەر. لە ئاخرا فێر بووبوو بە مزگەوتی سوور، هەموو نوێژی شێوانێ ئەچووە ئەوێ دەستەسڕەکەی ڕائەخست و لەبەر خۆیەوە ئەیوت: «حاجیاڵیمە، باڵەکیمە، ژن مردیمە، پەك کەوتیمە، یەکێ بە خێرا بابی: پیرەداکێ، پیرخوشکێکی هەبێ، وێم دا حەو پشتی دەچێتە بەحەشتێ!».

١٠٨. کابرایەك هەبوو «باوەنوور»ی ناو بوو. قەرزاری کابرایەکی شاری بوو. کابرا هەرچەند هاواری ئەکرد، باوەنوور هیچی نەبوو پێی بداتەوە. لە ئاخرا ڕۆژێ لە کەلەبەرێکا بەگیری هێنا و ڕاپێچی دا. باوەنوور وتی: بابە بۆ نیوەڕۆ وەرە بۆماڵەوە پارەکەم بۆ داناوی ئەتدەمێ.

باوەنوور چووەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام زۆر بە پەرۆش بوو. ژنەکەی لێی پرسی: بۆچ وا دۆش دایبردووی؟ وتی: وازم لێ بێنە قەرزاری کاورای شاریم، بەگیری هێنام و وتم: پارەکەتم لە ماڵەوە داناوە وەرە بۆی. ئێستا نیوەڕۆ ئەو دێت و هیچم نییە بیدەمێ، نازانم چی بکەم؟ ژنەکە وتی: خەمت نەبێ، کە هات من پێی ئەدەمەوە. کابرا وتی: چۆن؟ تۆ لە کوێت بوو؟ وتی: تۆ کارت نەبێ، کە ئەو هات تۆ خۆت مەخەرە بەرچاوی، من بۆی جێبەجێ ئەکەم.

کابرای شاری بۆ نیوەڕۆ چوو بۆ ماڵی باوەنوور و لەبەر قاپی وەستا و داوای باوەنووری کرد. ژنە لە پێش ئەوەدا کە کابرا بێت، هەندێ دڕکوداڵی لەبەر قاپییەکەی خۆیانا دانابوو، ئەنجا چوو بە پێشوازی کابرا، وتی: ها برا چییە؟ کابرا وتی: قەرزم لای باوەنوورە و بۆی هاتووم. ژنە وتی: بەخێر بێی، هەقەکەت لای منە، من ئەتدەمێ. کابرا زۆری پێ‌خۆش بوو وتی: دەبێنە. وتی: ئەو دڕکانە ئەبینی لەبەر قاپییەکە؟ وتی: بەڵێ. وتی: قەرزەکەت بەو دڕکانەوەیە. وتی: چۆن؟ وتی: «ئەوە ئەو دڕکانەم لەوێ داناوە بەیانی و ئێواران ڕانی ئاوایی بەوێدا دێت و ئەڕوا، خورییەکانیان ئەبێ بە دڕکەوە، من لێی ئەکەمەوە و ئەیشۆمەوە و ئەیرێسم و ئەیکەم بە جاجم؛ ئەیبەمە بازاڕ و ئەیفرۆشم و ئەیدەم بە پارە ئەیدەمەوە لە باتی قەرزەکەت!».

کابرا ئەم کەینوبەینەی زۆر بەلاوە سەیر بوو، دەستی کرد بە پێکەنین. باوەنوور لەسەر بانەوە خۆی شاردبووەوە، کە گوێی لە دەنگی پێکەنینەکەی بوو، ملێکی لار کردەوە و سەیرێکی کابرای کرد وتی: «ها سەیرکە، کە هەقەکەی خۆی دەستکەوتووەتەوە لە خۆشیانا پێ‌ئەکەنێ!».

١٠٩. کابرایەکی وردە شاتری هەبوو «گونە»یان پێ ئەوت. ڕۆژێك لە ڕێگادا تووشی کابرایەکی خێڵەکەی خۆیان بوو، پێی وت: ئەوە بۆ کوێ ئەچی؟ وتی: ئەچم بۆ خزمەتی شێخ. وتی: «بم وە ساقەت! پێی بێژە نوشتەیەکم بۆ بنێرێ، ڕۆحم وە فیای وێ! لەو نوشتانە کە خوا وە زەمیلە بۆی ناردگەسە خوارەوە!».

١١٠. وەختی خۆی پیاوێکی تورکمان هەبوو لە کفری ناوی «مووسا» بوو. سەر بە جەمیل‌بەگی بابان بوو. بابانەکان و جافەکان تۆزە

ناکۆکییەك هەبوو لە بەینیانا. داودبەگی جاف مووسا ئەگرێ و تێروپڕی لێ ئەدا و ئەشیەوێ بیخاتە ناو سیروانەوە، خەڵکوخوا لێی ئەپاڕێنەوە و نایەڵن و کابرا ئەگەڕێتەوە بۆلای جەمیل بەگ و کارەساتەکەی تێ ئەگەیەنێ. جەمیل بەگ گلە ئەنێرێ بۆ کەریم بەگی فەتاح بەگ ـ کە برا گەورەی داودبەگ بوو ـ وە ئەڵێ: بۆچی لە پیاوەکەمیان داوە؟ کەریم بەگیش وەڵام ئەنێرێتەوە بۆ جەمیل بەگ و ئەڵێ: «بابە ئێمە لە مووسامان داوە، کە تورکمانە و سەر بە ئێوەیە، ئێوەش بچن لە کفری لە باتی هەقەکەی خۆتان لە مەردان بدەن، کە ئەویش تورکمانە و سەر بە ئێمەیە!».

١١١. کابرایەکی جافی میروەیسی ئەچێتە کفری. کە ئەچێتە ماڵەوە خانەخوێکەی، ئاوی بۆ دێنن ئەیخواتەوە، سارد و خۆش ئەبێ. ئەپرسێ: ئەمە چییە وا ساردە؟ ئەڵێن: ئاوی شەربەیە. ئەویش کە ئەچێتە بازاڕ، شەربەیەك ئەکڕێ و پڕی ئەکا لە ئاو، لەگەڵ خۆی ئەیهێنێتەوە بۆ ماڵی خانەخوێکەی. شەوێ هەڵئەستێ ئاوی لێ بخواتەوە کە ئەینێ بە سەرەوە قوڵتەقوڵتی دێ. ئەڵێ: «ئەی گووی تۆی لێ‌نەوارێ خۆ بە تورکی خەریکە جمێنم ئەداتێ. ئا تۆ لێم‌گەڕێ تا ڕۆژ ئەوێتەوە، ئێستە لقاوی ئەم ماڵەم لە دەمایە و لەبەر ئەم ماڵە دەنگ ناکەم، سوەی توێ بتڕێنم وە ڕیشی باوکتا. دەویت باوك، با ئێستە تۆ ئەم جمێنانەت داوێ». بەیانی کە لە شار دەرئەچێ ئەیشکێنێ و ئەڵێ: «دە بڕۆ دەویت باوك، ئاوات لێ ئەکەم، جمێن ئەدەیتێ!».

١١٢. دەروێش ئەحمەد هەبوو خەڵکی سولەیمانی بوو. لە زەمانی تورکدا لە لەشکری «جەمال پاشای سەفاح»دا عەسکەر بوو. ڕیش و پەشمێکی بەردابووەوە. ڕۆژێك جەمال پاشا تەفتیشی عەسکەرەکان

ئەکا، ئەگاتە لای دەروێش ئەحمەد کە لە ڕیزی سەفەکەدایە. ئەوەستێ و دەست ئەبا بۆ ریشی دەروێش ئەحمەد و ئەڵێ: «ئەمە چییە؟» ئەویش دەست بەرز ئەکاتەوە سەلامی بۆ بگرێ، کوتوپڕ دەستەیە قاقەزی قومار لە باخەڵی ئەکەوێتە خوارەوە، ئەپەشۆکێ و ئەیەوێ قاقەزەکە هەڵگرێتەوە کە دائەنوێتەوە قاپێ عەرەقیش هەر لە باخەڵیا ئەبێ، ئەویشی لێ ئەکەوێتە خوارەوە. کە جەمال پاشا ئەمە ئەبینێ، واقی وڕ ئەمێنێ و ئەڕوا!.

.١١٣ کابرایەکی «جەباری» دنیا زستان ئەبێ، لەگەڵ کاروانا دێت بۆ کەرکووك. بەیانی ئەگەنە «تەپەلوو». بە کاروانەکە ئەڵێ: ئێوە بڕۆن تا من نوێژەکەی بەیانیم ئەکەم و پێتان ئەگەم.

ئاوی «تەپەلوو» بەچکە ڕووبارێکە سەرچاوەکەی لە قەرەحەسەنەوە دێت تا ئەگاتە ئەوێ زۆر دوورە، هەر هەوا لێی ئەدا و زۆر سارد ئەبێ. کابرا ئەچێتە سەر ئاوەکە تارەت بگرێ. دنیا ساردە، ئاو بووە بە شەختە. کە ئاو هەڵئەگرێ و ئەیدا بە خۆیەوە، خۆی لە بەریا ڕاناگرێ و هەڵئەبلۆقێتەوە، چەند جارێك ئاو ئەدا بە خۆیەوە هەر نایگرێ، لە ئاخرا ئەڵێ: «بکەم وە قنگ باوکتەوە! بیگرێ و نەیگرێ هەر ئەم جارەیە!». ئەوجارەشی پێوە ئەدا هەر نایگرێ. پاشان هەڵئەستێ ڕوو ئەکاتە ئاوەکە و ئەڵێ: «دەویت باوك، هەر ئەم ساردییەی تۆ بوو کەوا "تەپەلوو"و "لەیلان"ی کرد وە ڕافزی!». ئەمە ئەڵێ و ئەڕوا بە شوێن کاروانەکەدا.

.١١٤ شێخ ڕەزای تاڵەبانی زەمی کەسێکی کردووە. ڕۆژێك لەو بناری هەڵەبجەیە لە ماڵی وەسمان پاشا هەڵیدابوو. شێخ عومەری بیارە بە میوانی دێت بۆ ئەوێ؛ شێخ ڕەزاش لەوێ ئەبێ. کوڕگەل دەچنە بن دەستی شێخ ڕەزاوە کە زەمێکی شێخ عومەر بکا. شێخ ڕەزا هەرچەند

ئەکا چەشەی نابزوێ بۆ ئەم زەم کردنە، ئیتر لەبەر هەر شتێك بووە، ئەمە شێخ ڕەزا و شێخ عومەر خۆیان ئەیزانن.

بەیانی شێخ عومەر ئەیەوێ بگەڕێتەوە بۆ تەوێڵە، وڵاخی بۆ دێنن سواری بێ، شێخ ڕەزا پەلامار ئەدا ئەچێ ئاوزەنگی ماینەکەی ئەگرێ بۆ ئەوەی شێخ سوار بێ. شێخ عومەر ئەڵێ: «قوربان لە دوێنێوە من هەر لە خەیاڵی تۆدام؛ کەچی تۆ دەستی خۆتت وەشاند هەم سوار بوویت و هەم پێت گرتم!».

١١٥. «ئامینەخان»ی کچی قادربەگی کەیخەسرەوبەگی جاف کە ژنی «بارام‌بەگ» ئەبێ و بەشی بارام‌بەگی لە جافا لەو بارام‌بەگەوە هاتووە، بە سەید فەتاحی جەباری ئەڵێ: سەید تۆ چی ئەکەی وا هەر بەم لاوبەولادا ئەسوڕێیتەوە؟ وەرە من «بانەبۆر»ت ئەدەمێ ئاوای کەرەوە و بۆ خۆت تیایا دانیشە. سەی‌فەتاحیش ئەڵێ: «ئامینەخان بانەبۆر پیاوی وەکوو بارام‌بەگی ئەوێ بە لاتێکی وەکوو من ئاوەدان ناکرێتەوە». ئامینەخانیش ئەڵێ: دە بڕۆ هەر لات بە. (بانەبۆر: گوندێ بوو هی بەگزادەی جاف).

١١٦. شێخ هادی شێخ حەسەنی پشدەری چەند قسەیەکی نارد بۆ ڕشتە؛ لەوانەدا گێڕایەوە و وتی: کابرایەك ماخۆلانی کەوتبووە سەر ئەوە بچێ لە ئیش و کاری خوا ورد ببێتەوە، چونکە گەلێ جار شتی وای بەرچاو ئەکەوت هیچ نەئەچووە ئەقڵیەوە.

ئەم کابرایە بەم فرمانەوە لە دەشتێکا ئەسووڕایەوە تووشی کانی و سەراوێك بوو. دارێك لەسەر کانییەکە بوو. ڕۆژ درەنگ بوو، لە بن دارەکەدا ڕاکشا بۆ ئەوەی تۆزێ بحەسێتەوە، پاشان وتی: دیارە شەوم

بەسەرا دێت و لێرە ئەمێنمەوە جرِوجانەوەر و درِەندەش زۆرە؛ چاك ئەوەیە بچمە سەر دارەکە، نەوەك تووشی شتێك بم.

هەستا چووە سەر دارەکە و زۆری پێنەچوو سوارێك هات ئاو بخواتەوە. کە ئاوەکەی خواردەوە پریاسکەیەکی زلی پێ بوو، لێی کەوت و پێی نەزانی لێی دا رۆیشت. تومەز ئەم پریاسکەیە پارەیەکی زۆر بوو لێی بەجێ مابوو. کە کابرا لە چاو ون بوو، کابرایەکیتر دیسان بۆ ئاو خواردنەوە هاتە سەر کانییەکە. پریاسکە پارەکەی بەرچاو کەوت، پارەی هەلگرت و لێی دا رۆیشت.

دوابەدوای ئەو شوانێك رانەکەی دابووە پێش و رانی هێنا بۆسەر کانی بۆ ئاوی بەیانی. تەماشای کرد سوارەکەی یەکەمجار بە پرتاو گەرایەوە بۆسەر کانییەکە و رووی کردە شوانە و وتی: کابرا، پریاسکەیەکم لەسەر ئەم کانییە لێ کەوتووە و بێجگە لە تۆ کەسیش نەهاتۆتە ئێرە، پریاسکەکەم پێ بدەرەوە. کابرای شوانە وتی: باوکم وەڵڵا نەمدیوە، گەرم لێ لادە. لەم قسەیەك و لەو قسەیەك کابرای سوارە دای لە شوانەکە و شوانەکەی کوشت و ران بێشوان مایەوە و ئەویش بۆ خۆی لێی دا رۆیشت.

کابرا کە لەسەر دارەکە بوو لەم ئیشە زۆر سەری سورِ ما وتی: ئاخر خوایە من ئەڵێم ئیشەکانت هیچیان لە شوێنی خۆیا نییە، کەچی بەندەکانت پێم ئەڵێن: کافر بووە. ئاخر یەکێکیتر پارەکەی هەلگرت و بێئارەق بۆی دەرچوو، ئەم شوانە هەژارە چ سووچێکی هەبوو وا بە خۆرایی بە کوشتنت دا؟

ئەم لەم خەیاڵ و قسە کردنانە بوو، کوتوپرِ پیاوێکی رِیش سپی نوورانی پەیدا بوو، هاتە بن دارەکە و سەری بەرز کردەوە و وتی: کابرا دابەزە. کابرا لە ترسانا بە نیوەگیانێکەوە دابەزی. ئەمجا پێی وت: دیارە تۆ لەم

ئیشـە زۆر سـەرت سوڕ ماوە. وتی: ئەرێ وەڵڵا قوربان! ئاخر ئەمە ئیشـە خـوا کـردی؟ قـەزای دێزە بکەوێ لـە گۆزە ئەمەیە. خاڵـەی نوورانی وتی: کەواتە با من تێت بگەیەنم.

وتی: ئەو کابرایە کە هات پارەکەی هەڵگرت، ئەو پارەیە سەد لیرە بوو، وەختی خۆی ئەم کابرای سوارە سەد لیرەی بە زۆر لەو کابرایە سەندبوو، پێی نەئەدایەوە. هەرچەند کابرا هاواری ئەکرد کەڵکی نەئەگرت. کە هاتە سـەر کانییەکە سـەیری کرد سـەد لیرە کەوتووە، نەشـیئەزانی هی کێیە، هەڵی‌گرت و لێی دا ڕۆیشت، بە پارەی خۆی گەیشتەوە. ئەم شوانەش کـە تـۆ ئەیبینـی وا لەوێ کەوتـووە و تۆ لات وایە بە ناهەق کوژراوە، ئەمە وەختی خۆی باوکی ئەو سوارەی کوشتبوو؛ سوارەکەش نەیئەزانی کەوا ئەم باوکی ئەوی کوشتووە. بە ناوی پارەوە لێی دا و کوشتی. ئەمانە هەریـەك بە تۆڵەی خۆیان گەیشتنەوە، بەبێ ئەوەش پێ بزانن.

ئەوی یەکێك بکوژێت، هەر ئەبێ بکوژرێتەوە؛ ئەوی زوڵم و جەور لە یەکێ بکا، ئەبێ لە ئاخرا بیداتەوە دەست؛ زۆرلێکراو حەقی ناڕوا و زاڵمیش ئەبێ جەزای خۆی ببینێ. ئەمەبوو کارەساتی ئەمانە، ئیتر بچۆرەوە ماڵی خـۆت و دانیشـە و خـوا هـەر ئیشـێ کـە ئەیکا هەمووی لە شـوێن خۆیایە و هیچ ئیشێکی بێ مەسڵەحەت نییە.

کابرا کە ئەمەی چاوپێ‌کەوت، ئیتر تۆبەی کرد و لەو خەیاڵە پاشگەز بووەوە و چووەوە ماڵی خۆی!.

**١١٧.** «میمکەپانـێ» هەبوو، باشـکی و لـە عەشیرەتی جـاف بـوو. کوڕێکـی هەبـوو «مـەلا سەعید»ـی ناو بوو. مەلا سـەعید لە بنکـەی «بنەبـەراز» لەودیوی هەردەوە بوو بەلای «پیـواز»ەوە. ئەم مەلا سەعیدە ڕادیۆیەکی باتری ئەبێ، ڕۆژێك میمکەپانێ ئەچێ بۆلای مەلا

سەعیدی کوڕی. ڕادیۆکەش لەسەر ئێستگە کوردییەکەیە و گۆرانی کوردی ئەڵێ. هەڵئەستێ ئەچێ بۆ دەرەوە ڕادیۆکە داناخا، ئەوا ڕادیۆ گۆرانی ئەڵێ و میمکەپانێ بە لایەوە دانیشتووە.

زۆری پـێ ناچـێ میمکەپانـێ تاقەتـی ئەچێ و ڕوو ئەکاتـە ڕادیۆکە و ئەڵێ: «باوکـم مـەلا سـەعید چوەتـە دەرەوە و منیش پیر بووم، ئەوەندە تاقەتم لە گۆرانی نییە، ئەگەر بە زەحمەتی نازانی بیوڕەوە».

رادیۆ دیارە هـەر گۆرانـی خـۆی ئەڵێ. دیسـان میمکەپانـێ پێی ئەڵێ: «برام، پێم وتیت مەلا سـەعید لـە ماڵەوە نییە و منیـش گۆرانیم گەرەك نییە، بیوڕەوە!». هەر کەڵکی نابێ، ڕووی تێ ئەکاتەوە و ئەڵێ: «کاورا، تۆ چەنەباز و چەقاوەسوویت. من ئێژم گەرەکم نییە تۆ هەر وە زۆر دەنگی خۆت ئەفرۆشیت». ئەمـە ئەڵێ و هەڵئەستێ هـەچ نوێنێکیان ئەبێت ئەیهێنـێ ئەیخا بەسـەر ڕادیۆکـەدا و ئەڵـێ: «وە کـەلام ئێسـتە خەفـەت ئەکەم!».

رادیـۆ هـەر دەنگـی دێت، ئەمجا ئەڵێ: «دەویت باوك! تۆ دیارە ئێژی «بەچکەدۆم»ـیت تا لێت نـەدەم ئاقـڵ ناویـت». پەلامـاری گالۆکێـك ئەدات، دێنێ نوێنەکان لائەدا و ڕادیۆ ئەداتە بەر گالۆك، ورد و خاشـی ئەکا و ئەمجا کە ئەشکێ، ئیتر بێدەنگ ئەبێ. ئەڵێ: «دەویت باوك! تا خۆتت وە لێدان نەدا لە چەنەبازی نەکەوتیت».

پاش ئەوە مەلا سەعیدی کوڕی دێتەوە ئەڵێ: دایە ئەوە کوا ڕادیۆکە؟ ئەڵێ: ڕۆڵـە ئـەم کاورایـە زۆر بێفـەڕ و چەنـەوازە؛ هەرچەنـد پێـم وت: بـرام، من حـەز لە گۆرانی ناکەم؛ ئـەو هەر وازی نەهاورد، لە ئاخرا دامە بـەر تێلا و ئـەو وەختە بێدەنگ بـوو. زانیم بەچکەدۆمـە تا لێدان نەخوا بێدەنگ نابێ.

مەلا سەعید کە ئەچێتە سەر ڕادیۆ سەیر ئەکا ورد و خاش بووە بەسەر یەکا. ئەڵێ: خوا بتگرێ دایە بۆ ئیشێ کردت!.

.١١٨ مەلایەك لە کۆڕێکا وەعزی ئەدا و وتی: «کاتێ کە حەزرەتی ئیبراهیم هات حەرزەتی ئیسماعیلی کوڕی سەر ببڕێ، هەرچێ مەلایەکە هەبوو نەبوو، هەموو کەوتنە پاڕانەوە و پاشان خوا بەرانێکی نارد بۆ حەزرەتی ئیبراهیم و لەباتی حەزرەتی ئیسماعیل کردی بە قوربانی. جا ئێستە هەرکەس قوربانی بکا وەکوو ئەو قوربانییەی حەزرەتی ئیبراهیم وایە.

کابرایەك لە کۆڕی وەعزەکە دانیشتبوو هەستا و وتی: «ئەوە تۆ ئێژی چی؟ ئەو گشت مەلایەکەیە کەوتنە پاڕانەوە تا بەرانێکی لە دەست بووەوە، ئێستە من وە قسەی دەم هەڵپچڕاوێکی وەکوو تۆ تێرم ئەو مەڕە پەڕە فرە خاسەم ئەکەم وە قوربانی؟ دە بکەم وە قنگ دایك ئەو کەسەوە کە وە گوێت بکا!».

.١١٩ کابرایەك لەو دەشتی دزەییە ـ بلامانێ ـ هاتبوو بەسەریا مانگایەکیان هەبوو مانگاکەی گا بوو. پاش ماوەیەك مانگاکە ئاوس ببوو؛ دیارە گای لێپەڕیبوو. کابرا دوو سێ کوڕی هەبوو زۆر خۆشی‌خۆشییان بوو، هەموو جار ئەیانوت: باوە ئیشەڵڵا مانگاکەمان گۆلکە مێچکەیەك دێنێت. کابراش زۆر ترسی لێ نیشتبوو، ئەیوت: «کوڕم هەر گۆلك بێ قەیناکا». کابرا ترسی ئەوەی هەبوو لە باتی گوێرەکە بەچکە ئینسانێك بێنێت!.

.١٢٠ کابرایەك هەبوو دوو ژنی هەبوو. ژنەکان لە بەین خۆیانا وەکوو هەموو هەوێیەك تێك‌چوون؛ دەستیان کرد بە جنێودان بە

یەك. ڕۆژێك ژنێکی‌تر لە یەکێ لەو هەوێیانەی پرسی: ئەرێ خوشکێ تۆ منالّت هەیە لە مێردەکەت؟ وتی: من حەوت کوڕم هەیە. هێندووکە هێندووکە ـ پەنجەشی بۆ بەرز ئەکردەوە ـ. وتی: ئەی هەوێکەت؟ وتی: ئەو یەکێکی هەیە ئەوەندەی خرسێك. باوەشی بۆ ئەگرتەوە وەکوو یەکێ وێنەی بکێشێ.

۱۲۱. کابرایەك کوڕێکی نالەبار و بێ‌گوێی هەبوو؛ زۆر لێی ناڕازی بوو. ڕۆژێك لەلای دۆستێکی خۆی دەستی کرد بە دەردەدڵ کردن لە دەست کوڕەکەی و پێی وت: بەڵکوو تۆ نەختێ ئامۆژگاری بکەی. ئەویش وتی: برام، کوڕەکەت زۆر بێ‌گوێ و لاسارە. ئامۆژگاری پیاوی شێت نەبێ بەگوێی ناچێ. باوکەکەش وتی: «ئای بە قوربانت بم! ئاخر بۆیە منیش بە تۆ ئەڵێم!».

۱۲۲. لەو موکریانە مەلایەك هەبوو مەلا «یاروەلی» ناو بوو؛ موریدی شێخی بورهان بوو. پیاوێکی هەتا بڵێی بەدین و لەخواترس بوو. لە دێی «گوڵۆڵان» بوو، لە لای پیرۆت ئاغای گەورە. «خمەجوو» هەبوو ئەویش هەر لە گوڵۆڵان بوو.

ڕۆژێ پیرۆت‌ئاغا دووسەد تمەن لە خمەجوو ئەستێنێ بە ناوی جەریمەوە. خمە دێ بۆلای مەلا یاروەلی کە بچێت بۆلای ئاغا و تکای لێ بکا پارەکەی بداتەوە. مەلا یاروەلیش بە ماوەی ئەو ژیانە پان و درێژەی ڕووی نەکردۆتە ماڵی پیرۆت‌ئاغا، بەلایەوە وابوو ئەگەر بە بەر سێبەری حەوشەکەیا تێ‌پەڕێ، ئەچێتە جەحەندەم. چونکە ماڵی ئاغای هەمووی بە حەرام ئەزانی. هەموو کەس ئەمەی بەرانبەر بە مەلا یاروەلی ئەزانی.

مەلا یاروەلیش بە خمە ئەڵێ: «خمە تۆ ئەزانی من ناچم بۆ ماڵی پیرۆت‌ئاغا، بەڵام باشە ئەگەر هاتە ئێرە پێی ئەڵێم: بتداتەوە». خمەش ئەڵێ: مامۆستا ئەوە تۆ ئەڵێی چی؟ بە حەزرەتی مووسا هەتا دوو سەعاتی‌تر هەمووی ئەکا بە قومار و شاییەکی لا نامێنێ. خمە زۆر ئەڵێ و مەلا یاروەلی کەم ئەیبیست، هەر ئەڵێ: با بێتە ئێرە پێی ئەڵێم.

لە ئاخرا خمە پێی ئەڵێ: «مامۆستا ئەگەر بچیت بۆلای ئاغە و ئەو پارەیەم بۆ بستێنیتەوە دوعات بۆ ئەکەم بچیتە بەهەشت». مەلا یاروەلی سووك و باریك بەبێ قسە هەڵئەستێ و ئەچێ بۆ ماڵی پیرۆت‌ئاغا. پیرۆت‌ئاغا لە خۆشیدا پێی ناکەوێتە عەرز، چونکە تا ئێستە مەلا یاروەلی نەچووەتە ماڵی. مەلا یاروەلی بۆ پارەکەی خمەجوو پێی ئەڵێ: ئەویش بەبێ قسە هەر دووسەد تمەنەکە خێرا بە پیاوی خۆیا ئەنێرێتەوە بۆ خمە و پێی ئەدەنەوە.

ماوەیەکی پێ ئەچێ، شێخی بورهان ئەمە ئەبیسێتەوە کەوا بەو جۆرە مەلا یاروەلی چووەتە ماڵی پیرۆت‌ئاغا، وە ئەشیزانی تا چەند ئەندازە مەلا یاروەلی لەخواترسە. ئەنێرێ بەشوێنیا و ئەیهێنن. لێی ئەپرسێ: مەلا یاروەلی بیستوومە خمەجوو وتوویە: دوعات بۆ ئەکەم بچیتە بەهەشت! بچۆ ئەو پارەم لە پیرۆت‌ئاغا بۆ بستێنەوە، ئەمە ڕاستە؟ ئەویش ئەڵێ: بەڵێ قوربان ڕاستە. ئەڵێ: جا چۆن تۆ بە دوعای جوو ئەچیتە بەهەشت؟ ئەڵێ: «قوربان ئەوەندە دڵم بە بەهەشتەوەیە ئەڵێم بەڵکوو تەنانەت دوعای جوویشم بۆ بکەوێتە کار و هەر بەو شەرتە بیبینم!».

١٢٣. لە دەوری «عبدالحمید»دا، عەبدولحەمید فەرمانی دابوو کە «فەلە» نەیەڵن؛ یا بیانکوژن یا موسڵمان ببن. کوردێك تووشی

فەلەیەکی دراوسێی خۆیان ئەبێ، لوولەی تفەنگی لێ ڕائەکێشێ و ئەڵێ: کوڕە کافر، موسڵمان بە! ئەگینە ئەتکوژم. ئەویش ئەم ئەناسێ ئەڵێ: برا ئێمە دراوسێ بووین و ناسراوی یەکین چۆن ئەمکوژی؟ ئەویش هەر ئەڵێ: کوڕە کافر! ئەگەر ئەتەوێ نەتکوژم موسڵمان بە. ئەویش ئەڵێ: باشە موسڵمان ئەبم بەڵام تۆ خۆت ئەزانی من فەلەم، نازانم بڵێم چی؟ ئەوا ئەمیش لوولەی تفەنگی لە کارایە هەر ئەڵێ: موسڵمان بە ئەگێنە ئەتکوژم، ئەویش هەر ئەیوت ئاخر نازانم بڵێم چی؟ ئەمجا کەوتە ئێرە کابرای کوردە وتی: ها وەڵڵا نازانم بڵێیت چی!.

١٢٤. مەلا ڕەشیدێکی «چیچۆران»ـی هەبوو لە سەگ زۆر ئەترسا، پێیان وت: تۆ چەند فێڵ ئەزانی کە خۆت لە سەگ ڕزگار بکەی؟ وتی: «زیاتر لە سەد فێڵ ئەزانم، بەڵام ڕاستی چاکتریان ئەوەیە نە من چاوم بەو بکەوێ، نە ئەو چاوی بە من بکەوێ!».

١٢٥. نوێژ بە جەماعەت ئەکرا. کابرایەکی کەڕ لە تەنیشت کابرایەکەوە ڕاوەستا بوو کە بۆنی دەمی ئەهات. کابرای دەم بۆگەن سەری نا بەلای کابرای کەڕەوە وتی: لام وایە ئیمامەکەمان سەهوێکی کرد لە نوێژەکەدا. کەڕەش وتی: بەڵێ، تسێکی کەند!.

١٢٦. شێخ حەمەمینی مەولاناوایی هەبوو وتی: لەو کوێستانەی لای ئێمە کابرایەکی جاف ڕێوی قەپی لێ گرتبوو، هاتە لام لە رووی نەئەهات بڵێ: ڕێوی قەپی لێ گرتووم؛ وتی: یا شێخ سەگی ئەو ماڵە گۆرانە گرتمی، نوشتەیەکم بۆ بکە. وتی: کە دەستم دا بە نووسینی نوشتەکەوە وتی: «توخوا یا شێخ، برێ لە نوشتەی ڕێویشی تێ خە!».

.۱۲۷ ئەو سەردەمە کە ماین‌سواری باوی هەبوو، هەندێ کەس لە سولەیمانی ئێواران ئەسپی چاك‌چاکیان ئەڕازاندەوە و ئەچوون لەو دەشتی کانیسکانە مەیدان‌بازی و غارغارێنیان دەکرد. «عەلی‌برزۆ» هەبوو قەساب بوو، هەر لە خۆی ئەهات ماینی کەحێلە بڕازێنێتەوە بە ڕەخت و خشڵی زیوین و خۆیشی چەفتەی سورمە و مشکی تێکەڵاو کاو لە سەری بەستێ و لە ناوەڕاستی زینەکەدا وەکوو سنگ بچەقێ.

ئێوارەیەك ئەم عەلی‌برزۆیە لە کاتی غارغارێنا لە مەیدان‌بازیدا پێش هەموو سوارەکانی‌تر کەوت. عەزیزبەگ هەبوو لەولاوە دەستی کرد بە هەڵپەڕکێ و پێکەنین و خۆشی‌خۆشی. پێیان وت: بۆچ وا خۆشی‌خۆشیتە؟ بۆ ئەسپەکەی عەلی‌برزۆ هی تۆیە؟ وتی: نەوەڵڵا، بەڵام لەغاوی ئەسپەکەی من بۆم دروست کردووە!.

.۱۲۸ کابرایەکی مەنگوڕ هەبوو «بەکر»ی ناو بوو. لەبەر ئەوە دڵتەڕ بوو، هەموو جۆرە قسەیەکیان لێوە ئەکرد. ڕۆژێك مەلاکەیان پێی ئەڵێ: مام بەکر، ئەوا کەوتیە ناو ساڵەوە، ئیتر ڕوو بکەرە خوا و تەوبە بکە؛ بچۆ حەجێکیش بکە با خوا هەموو گوناحێکت بشواتەوە. ئەویش وتی: مامۆستا ڕوو لە خوا کردن باشە و هەمووی ئەکرێ، بەڵام بۆ حەجەکە پارەم نییە. مامۆستاش وتی: تۆ هەر خۆتیت، کەست بەشوێنەوە نییە، خانووێکت هەیە، بیفرۆشە و بە پارەکەی بچۆ حەج بکە. ئەویش وتی: «کە ئەچم بۆ حەج یا دێمەوە، یا لەوێ ئەبم. ئەگەر هاتمەوە لەکوێ دانیشم؟ ئەگەر نەهاتمەوە خوا پێم ناڵێ: هەی کەری کوڕی کەری سەگباب! خانووی خۆتت فرۆشتووە و هاتووی لە قنگی خانووی منا دانیشتووی؟ یاڵڵا بۆ دەرەوە. مامۆستا ئیتر دەمی بوو بە تەڵەی تەقیوەوە!.

١٢٩. «حەمەکەر» هەبوو خەڵکی «کاژاو» بوو.لە «سەفەربەلگە»کەدا «قاف»ـیان کردبوو. بەوە بۆ خۆی بردبوویەوە سەر. زابتەکەی پێی ئەوت: بچۆ بۆ شەڕ. ئەیوت: ئەفەندی وەڵڵا ئەوانە کە تۆ ئەڵێی دوژمنن و من بچم بۆ شەڕیان، نە من کەسیان ئەناسم و نە ئەوانیش کەسیان من ئەناسن. ئیتر ئەم دوژمنایەتییە لە کوێ بوو تا من بچم شەڕیان لەگەڵ بکەم؟!.

١٣٠. ژنێک منداڵێکی لە باوەشا بوو ئەگریا. ئەمیش هەر لەگەڵی خەریک بوو ژێر نەئەبووەوە. کابرایەک لەوێ بوو ویستی ژێری کاتەوە دەستی ئەدا بە پشتیا و ئەیوت: «ژێر نەبیتەوە هەڵئەستم دایکت ئەگێم». منداڵە هەر ژێر نەبووەوە. ژنە وتی: «بڕوا ناکا تا بە چاوی خۆی نەیبینێ!».

١٣١. ژنێک جارێک ئەچێتە لای قازییەک شکات لە مێردەکەی ئەکا، ئەڵێ: من هێشتا لە سەر هەڕەتم و ئەم مێردەم حەقی خۆمم ناداتێ. قازی ڕوو لە پیاوەکە ئەکا و ئەڵێ: برام تۆ ئەڵێی چی؟ ئەڵێ: قوربان من ئەوەی لە تاقەتما بێ درێغی ناکەم. ژنە ئەڵێ: «من شەوێ لە پێنج جار کەمتر قایل نابم». قازی ئەڵێ: برا تۆ چی ئەڵێی؟ ئەڵێ: بەخوا قوربان جەنابی قازی من لە سێ جار زیاترم پێ ناکرێ. قازی ئەڵێ: «شتێکی زۆر سەیرە، هیچ دەعوایەک نەبوو بکەوێتە لای من عەزیەتێکی بۆ من تیا نەیەڵنەوە. بڕۆ دایکم، دووەکەیتر لە ئەستۆی من!».

١٣٢. ژنێک هەبوو «خاتووسەمەن»ـی ناو بوو، لەگەڵ مێردەکەیا لەسەر ئیشی شەرعی تێکچوون و مێردەکەی هەڵگرت چوون بۆلای قازی شار بۆ شکات. ژنە وتی: جەنابی قازی! ئەم مێردەی من تا

هەتیوی دەست کەوێ لەگەڵ منا نانوێ. پیاوەکە وتی: قوربان درۆ ئەکا وا نییە. قازی تۆزێ ڕاما و بە کابرای وت: ئا بێنە دەعباکەت تاقی بکەمەوە بزانم وایە یا وا نییە؟ کابرا نایە مستی. «بەرەکەت دا»، قازییەکە هەتا بڵێی ناشیرین بوو، دەعباکەی کابرا هەر لووتی دائەژەند. ژنە وتی: قوربان ئەوە ئەگەر سنگیش بێ ئەو سەر و ڕوومەتە جوانەی جەنابت ببینێ ئەبێ بە بەلەك!.

قازی فەڕاشێکی جوانی هەبوو. ژنە وتی: ئەمر بکە با ئەو فەڕاشە بیگرێ و تاقی کاتەوە. قازی ناچار ئەمری کرد بە فەڕاش. کابرا هەر کە نایە مستی فەڕاشەکەوە دەعباکەی وەکوو حەیتەی لێ هات. قازی وتی: «یا فاسق! ژنی خۆت بەرەوە و تەماع مەکەرە فەڕاشی قازی!».

١٣٣. ئەحەی‌کرنوو جارێك ئەچێ بۆ ئەو «شارباژێڕ»ە بۆ مێوژە ڕەشکە کڕین، لەولاوە بە شارەزووردا دێتەوە، ئەگاتە «موان». لەوێ پیرێژنێك بەرۆکی ئەگرێ و ئەڵێ: تۆ حەکیمی؟ ئەڵێ: ئا. ئەڵێ: «بەقوربانت بم سەر سنگم خیزەی لێوە تێ، ئێژن لرخەلرخی مردن هەس. ئەترسم ئەمە ئەو لرخەیە بێ. لرخەی مردن چییە؟» ئەویش ئەڵێ: «کچێ مەترسە، لرخەی مردن ترپی پێ نەگەیشتووە!».

١٣٤. ژنێك هەبوو مێردێکی زۆر ناقۆڵا و بزەنی هەبوو، ناوی «شاپڵنگ» بوو. ڕۆژێك ژنەکە شاپڵنگ هەڵئەگرێ و ئەچێتە لای قازی شکاتی لێ ئەکا، ئەڵێ: جەنابی قازی من لە بەردەست ئەم کابرایەدا هیچم پێ ناکرێ و تەنگ هاتووم بە دەستیەوە؛ ڕێگایەکمان بۆ دانێ. قازی بۆیان ئەبڕێتەوە لە شەوێ پێنج جار زیاتر نەچێتە لای. شاپڵنگ چار ناچار ڕازی ئەبێ و ئەگەڕێتەوە.

کە ئەگەنە بەر دەرگا شاپڵنگ ئەگەڕێتەوە و ئەڵێ: قوربان جەنابی قازی لێی بپرسە بزانە ئەبێ بە قەرز بەرکوڵ و مەرکوڵی لێ بسێنم؟ قازی لە ژنە ئەپرسێ و ژنە ئەڵێ: قەیدی نییە و ئەچنەوە.

بەشێکی شەو ئەڕوا و ناڕوا ژنە هەڵدێت و ئەڕوا بەو شەوە قاپی ماڵی قازی ئەگرێ بە کۆڵەوە ئەڵێ: «قوربان جەنابی قازی ناتوانم هەڵی‌بگرم هێشتا بەشێکی ئیمشەو نەڕۆیشتووە و حەقی پێنج شەوی بە قەرز لێ سەندووم. ئەمە بێجگە لە بەرکوڵی سەرئێوارە». قازیش ئەڵێ: «دایکم، ئیشەکەی ئێوە پێچەوانەیە ئەگەر پێچەوانە نەبوایە من خۆم چارم ئەکرد، بەڵام ئێستە بڕۆ قەرز دوو ماڵ ئاوەدان دەکاتەوە، ئەمە لە حەدیسی شەریفدا هەیە!».

١٣٥. جارێك لە سولەیمانی شێخ محەمەدی بەرزنجی لە مزگەوتی گەورە وەعز ئەدا، ئەو ڕۆژە کۆڕی وەعزی گەرم ئەبێ. شێخ مەحموودی حەفید و سەی نووری نەقیبیش لە کۆڕەکەدا ئەبن. وا ڕێ کەوتبوو وەعزی ئەو ڕۆژە لە بارەی «لواط»ـەوە بوو؛ شێخ موحەممەد ئەڵێ: هەرکەسە منداڵێکی خراپ کردبێ ڕۆژی قیامەت منداڵەکە ئەبەستن بە گەردەنی ئەو کەسەوە و ئەبێ بەو جۆرە لەسەر پردی سیرات بپەڕێتەوە».

سەی نووری نەقیب کە گوێی لەم وەعزە ئەبوو، خوڕخوڕ ئاو بە چاویا ئەهاتە خوارەوە. شێخ‌مەحموود لە تەنیشتیەوە بوو کە سەیری گریانەکەی کرد وتی: خاڵە سەیی مەگری، تۆیش ئەو ڕۆژە بە پیادە نامێنیتەوە. سەی نووری لە گریان وەستایەوە و وتی: یا شێخ لێرەشا واز لەم قسانە نایەنی؟!.

١٣٦. لە دیاربەکر پیاوێك هەبوو «حیفۆ»ی ناو بوو. ئەم حیفۆیە پیاوێکی دەوڵەمەند و بەدەسەڵات بوو. دز و درۆزن زۆر تەماعیان تێ‌ئەکرد؛ بەڵام بۆیان ڕێ نەئەکەوت. وەکوو بە دەوڵەمەندی ناوبانگی دەرکردبوو، قایمکارییەکەشی بەو جۆرە ناوی دەرکردبوو. ڕۆژێك دەستە دزێکی کوڕوکاڵ دائەنیشن و ئەم باسی قایمکاری حیفۆیە دێتە ناوەوە: کە کەس ناتوانێ دزی لێ بکا، یەکێك لەوانە گرەو ئەکا لەگەڵ ئەوانی‌ترا کە ئەگەر بچێت و دزی لێ بکا، بەرانبەر ئەوە ئێمەش شتی ئەدەینێ. لەسەر ئەم بڕیارە لە یەك جیا ئەبنەوە.

شەوێ کابرای دز ئەچێ بۆ ماڵی حیفۆ، ئەتوانی بچێتە ژوورەوە. حیفۆ لێی بە ئاگا دێت، بەبێ چرپە هەڵئەستێ دێ ئەمدیوی دەرگاکەی لێ ئەگرێ و دەرگاکەی لێ پێوە ئەدا. دزە لە ژوورەوە ئەمێنێتەوە. پاش ماوەیەك حیفۆ پیاوێکی لا ئەبێ «سمۆ»ی ناو ئەبێ، دزەکە ئەزانێ ئەو پیاوەی لا هەیە و ئەیناسێ؛ بەڵام ئەو شەوە لە ماڵ نابێ و حیفۆیش ئەزانێ کە لە ماڵ نییە، بە دەسانقەست بانگ ئەکا: سمۆ، سمۆ. دزە بۆ ئەمە «شوێنەونی» خۆی بکا و ڕێگایەك بۆ دەرچوون بدۆزێتەوە، خۆی ئەکا بە سمۆ و ئەڵێ: بەڵێ. دنیاش تاریکە. حیفۆ ئەڵێ: ئا وەرە تۆزێ قاچم بشێلە. دزە دێت و دەست ئەکا بە قاچ شێلانی حیفۆ. دزە دەست و پەنجەیەکی نەرمی ئەبێ لە هی سمۆ نەرمتر. حیفۆ دەعباکەی ڕاست ئەبێتەوە. ئەڵێ: ئا سمۆ وەرە پشت هەڵکە و لە کۆشی خودانی خۆت دانیشە. دزە هەر بۆ ئەوە پێی نەزانرێ کە دزە، چار ناچار وا ئەکا. حیفۆیش چار ناچار وای لێ ئەکا.

پاش ماوەیەك دیسان حیفۆ ئەڵێ: ئا سمۆ وەرە کۆشی خودانی خۆت، ئەویش ئەچێ و ئەمیش ئەبێ. بە گشتی پێنج جار وای لێ ئەکا. حیفۆ

بارگیرە لەڕێکی لاوازیان لە ماڵا ئەبێ، بۆ جاری شەشەم بانگ ئەکا سمۆ! ئەڵێ: بەڵێ. ئەڵێ: ئا بچۆ ئاوی ئەو بارگیرە بدە.

دزە ئەچێ دۆلکە ڕائەهێڵێتە بیری ئاوەوە ئاوی پێ هەڵێنێ، بەڵام دۆلکە دڕاوە، هەتا ئەیکێشێتەوە سەر بە حاڵ تۆزێ ئاوی تیا ئەمێنێ، ئەیدا بە بارگیر. بارگیر هەر بەرزمانیشی ناکەوێ، بە ناچاری دایئەهێڵێتەوە بیرەکە و جارێکی‌کە سەری خاتەوە، ئەمیش نازانێ دۆلکەکە دڕاوە، بەم جۆرە چەند جار ئەم دۆلکەیە ئەخاتە بیرەکە و هەڵی‌ئەکێشێتەوە و بارگیر هەر تێر ناخواتەوە.

کە ئەگاتە ئەم شوێنە حیفۆ گۆیا خەو لە خۆی ئەخا، دزە بە دەرفەتی ئەزانێ بۆی دەرئەپەڕێ و دەرئەچێ. کە دێتە دەرەوە سەیر ئەکا وا دەستەدزێکی‌تر خەریکن دیواری ماڵەکەی حیفۆ ئەکەنەوە بۆ ئەوەی بچن شتێك بدزن. ئەڵێ: «کوڕە ئەوە خەریکی چین؟ عەزیەتی خۆتان مەدەن. ئەم ماڵە هیچی تیا نییە، تەنها دوو شت نەبێ، پیاوێکی قورمساغی تیایە ئەڵێی ڕۆنی مەیموونی خواردووە، لە گان تێر ناخوا. ماینە قۆڕێکیشی تێدایە ئەڵێی ئاوبەنیەتی، لە ئاو تێر ناخواتەوە. ئیتر بۆ کوێ ئەچن؟».

.١٣٧ تازە شەمەندەفەر داهاتبوو، بێجگە لە زەلامەکە هەر گیانلەبەرێکی‌تر بخرایەتە شەمەندەفەرەوە ئەبوایە خاوەنەکەی پارەی لەسەر بدایە.

کابرایەکی کوردی خەڵکی ئەو دەوروبەرەی «لەیلان»ـە سواری شەمەندەفەر ئەبێ کە بچێت بۆ بەغدا. کەڵەشێرێکی پێ ئەبێ؛ ئەگەر کەڵەشێرەکە بە ئاشکرا لەگەڵ خۆی بەرێ، ئەبێ پارەی لە سەر بدا،

ئەویش ئەو پارەیەی نابێ بیدا. ناچار کەڵەشێرەکە ئەخاتە ناو دەرپێکەیەوە و لەوێدا ئەیشارێتەوە. کە لەناو شەمەندەفەرەکەدا دائەنیشن، بە ڕێکەوت پیرێژنێکی عەنکاوەیی هەندێ پەنیری پێ ئەبێ و لە تەنیشت ئەم کابرایەوە دائەنیشێ. کابرا کونێك لە عاستی نافەکی دەرپێکەیدا ئەبێ، کەڵەشێرەکە هەموو جار لەو کونەوە سەر دەردێنێ و دەنووکێك لە پەنیری پیرێژن ئەدا و سەر ئەباتەوە ناو دەرپێکە. ئیتر بە تەواوی بە پەنیرەکە فێر ببوو.

لە ئاخرا پیرێژن پێی ئەزانێ و تەماشا ئەکا ئەوا هەر جارە لەناو لنگی ئەم کابرایەوە شتێکی سەرسوور دێتە دەرەوە و تۆزێ لە پەنیرەکەی ئەبا و ئەگەڕێتەوە دواوە. زۆر واقی وڕ ئەمێنێ! تەنانەت ئەم واق وڕمانەی ئەم، سەرنجی کابرا ڕائەکێشێ و ئەڵێ: ئەوە وا بە کوڵ سەیری چی ئەکەی؟ کابراش بە حاڵەکە ئەزانێ. ژنە ئەڵێ: «بەخوا برا گەلێ کێرم دیوە، بەڵام تا ئێستە کێری پەنیرخۆرم نەدیوە!».

**١٣٨.** کابرایەکی موکریانی ئەچوو بۆ «بیجاڕ». لە نزیك شارەکەوە تووشی کەروێشکێك بیوو، گرتبووی و بردبوویە ناو شارەکەوە و لەوێ بردبوویە بازاڕەکەوە بیفرۆشێ. ئەوانیش بێزیان لە کەروێشك دێتەوە. بە هەرجۆر بوو کابرایەکی سوننی مەزهەبی لێ پەیدا بووبوو بۆ کڕینی. هەر شتێك لەو شارە بفرۆشرایە ئەبوایە ڕەسمی حوکومەتی لێ بدرایە. قۆچانچی ویستی لە قۆچانەکەدا ناوی ئەم کابرایە بنووسێ لە دەڵاڵەکەی پرسی: ناوی چییە؟ وتی: ئەبووبەکر. ناوی باوکت چییە؟ وتی: عومەر. ناوی باپیرت چییە؟ وتی: عوسمان. کابرای قۆچانیش هەروا سەیری دەکردن، لە ئەنجاما بە دەڵاڵەکەی وت: ئەم درێژ دادڕیەی ناوێ، چی بنووسم؟

دەلاڵەکە وتی: «هیچ، ئەمە گوویەك بوو خواردی، بنووسە: خاوەنی کەری دێزا!».

١٣٩. کابرایەکی مەراغەیی «شێعە» ڕێی ئەکەوێتە سابڵاغ. لەوێ ئەچێتە مزگەوتی سوور سەیر ئەکا ناوی هەر چوار خەلیفەکە بە خەتێکی جوان و مەرەکەبێکی ڕەش لەسەر پارچە کاغەزێك نووسراوە و کوتێنراوە بە دیواری مزگەوتەکەدا. کە ئەمە ئەبینێ زۆری پێ ناخۆش ئەبێ، لە هەلێك ئەگەڕێ کە بیانکوژێنێتەوە. بۆی ڕێ ئەکەوێ، مزگەوتەکە چۆڵ ئەبێ؛ ئەمیش بە پەلەپەل ئەچێ بە تف ناوی هەر سێ خەلیفەکە بکوژێنێتەوە و تەنها ناوی عەلی بێڵێتەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەترسێ و بە پەلە ئەبێ لە باتی ئەوە ناوی ئەوان بکوژێنێتەوە، کەچی ناوی عەلی ئەکوژێنێتەوە. جا لە پاشا کە سەیری ئەکرد و تازە بۆیشی نەئەکرا چاری بکات ئەیوت: «لە تەنیشت ئەوانەوە دانیشی، ئەبێ ئەوە سزات بێت و ئاوات بەسەر بێت!».

١٤٠. ساڵێك «سالار الدّولە» ڕووی کردبووە کوردەواری، بەو نیازەی کوردەکان یارمەتی بدەن و تاج و تەختی ئێران وەربگرێتەوە. ڕێی ئەکەوێتە گەرمیان ماڵی کەریمبەگی فەتاحبەگ؛ ماوەیەك لەوێ ئەمێنێتەوە. ڕۆژێك لەگەڵ کەریمبەگ و ئەوانا ئەچن بۆ ڕاو. سەرلەئێوارە لە یەك دائەبڕێن. «سالار الدّولە» لەو دەشتەدا شەوی بەسەرا دێت. تاقە ماڵێکی جاف لەو ناوەدا ئەبێ، شەوێ ئەچێتە ئەوێ. کابرای جافە چی بۆ ڕێك ئەکەوێ بۆی دائەنێ. ئەمیش هیلاك ئەبێ، ئاو زۆر ئەخواتەوە. یەکەمجار کە داوای ئاو ئەکا ئاوەکە ئەخواتەوە ئەڵێ: من یەکێ لە پیاوەکانی «سالار الدّولە»م. جاری دووەم کە ئاوی بۆ دێنن ئەیخواتەوە ئەڵێ: من

یەکێ لە پیاوە گەورەکانی قاجارم. جاری سێیەم کە ئاوی بۆ دێنن ئەیخواتەوە و ئەڵێ: من «سالار الدّولە»م.

کابرای جافە ناوی «سالار الدّولە»ی بیستووە، نایناسێ، ئیتر ئەگاتە تینی و ئەڵێ: «جاری یەکەم کە ئاوەکەت خواردەوە وتت: پیاوی «سالار الدّولە»یت، جاری دووەم وتت: یەکێکم لە پیاوە گەورەکانی قاجاڕی، جاری سێیەم وتت: «سالار الدّولە»م. ئەم جارە بیخۆیتەوە داوای خوایی ئەکەی. وە کەلام من و خوا لە ماڵێکا پێکەوە نامانکرێ! دەویت باوك ئیتر لە سەری مەڕۆ.

کە ئەکەوێتە سبەینێ کەریمبەگ و ئەوان کۆ ئەبنەوە و «سالار الدّولە» لەوێدا ئەدۆزنەوە. جافی ئەو دەورەش ئەوەبوو زۆر لە کەریمبەگ ئەترسان، کابرا لە ترسی ئەوەی نەوەك «سالار الدّولە» قسەکە بگێڕێتەوە بۆ کەریمبەگ، خەریك ئەبێ ماڵەکە بەجێ بێڵێ. «سالار الدّولە» هەستی پێ ئەکا و ئەڵێ: بانگی کەن. کابراکە ئەهێننەوە لە ترسا ڕوو ئەکاتە «سالار الدّولە» و ئەڵێ: «وەو شێخ کەریمە ئەگەر داوای چوارەمیشت بکردایە هەر ڕاستت ئەکرد». پاشان «سالار الدّولە» قسەکە ئەگێڕێتەوە و هەندێ پارەش ئەدا بە کابرا.

١٤١. حەمەی سانئەحمەد هەبوو لەو هەورامانە، هەندێ جار ئەیکردە ئەمبەرەوە مەڕ و شتی ئەدزی و ئەچووەوە. کە ئەچووەوە مەڕەکانی سەر ئەبڕی و ئەیبەخشییەوە بە خەڵکا، خەڵکەکەش ئەیانزانی ئەمە هی دزییە. ئەیانوت: ئەمە چ مەعنایەکی تێدایە تۆ مەڕ ئەدزی و ئەیبەخشیتەوە؟ ئەیوت: «ئێوە نازانن، خێری بەخشینەوەکەی لەگەڵ گوناحی دزییەکەیدا بەرانبەر ئەوەستێ. لەم ناوەدا منیش پێست و ڕیخۆڵە و دووگەکەم دەست ئەکەوێ و بە قازانج بۆم ئەمێنێتەوە!».

١٤٢. مەلا ڕەشیدێکی داودە هەبوو، بانگبێژ بوو لە مزگەوتی مەنارە نەخشینە لە کەرکووك. هەروەخت کە بانگی ئەدا بە دەم بانگدانەکەوە دەستی ئەکرد بە هەڕاکردن بەسەر بانەکەدا. جارێك لێیان پرسی: ئەوە بۆچ وا لە کاتی بانگدانا هەڕا ئەکەی؟ ئەیوت: «خەڵك ئەڵێن تۆ لە دوورەوە دەنگت خۆشە هەڕا ئەکەم بۆ ئەوە لە دوورەوە گوێم لە دەنگی خۆم بێ، بزانم ڕاست ئەکەن دەنگم خۆشە؟!».

١٤٣. لە کەرکووك دوو منداڵ فێر بووبوون بە یەك. هەر لە زەمانی منالییەوە هەتا دەوری پیری ئەوە ئیشیان بوو. ڕۆژێك لەسەر مەنارەی مزگەوتێك لە «قەڵا» ئەو ئیشە ئەکەن و پاش لێبوونەوە، شوێنەکەیان بەرز ئەبێ، سەیرێکی شارەکە ئەکەن. یەکێکیان ئەڵێ: بەخوا ئەم شارە چاکە هەتا بێت وێرانتر و کاولتر ئەبێ». ئەویکەیان ئەڵێ: «شارێك کە پیرە موبارەکەکانی من و تۆ بین لەمە چاکتر و ئاوەدانتر نابێ!».

١٤٤. پاشاکۆرەی ڕواندز لەشکری ناردبوو بۆ سەر هەولێر. کابرایەکی «سیان» لە لەشکرەکەدا بوو، قەڵغانێکی پێ بوو لە بن قەڵاتی هەولێر؛ یەکێك لەسەر قەڵاتەکەوە بەردێك فڕێ ئەداتە خوارەوە بەردەکە ئەکەوێ لە سەر کابرای سیان سەری ئەشکێ. جا کابرای سیان ئەیوت: «ئەرێ کابرا! چما تۆ کوێری! ئەم قەڵغانە زلە نابینی وا بەردەکە ئەدەی لە سەری من و سەرم ئەشکێنی!؟».

١٤٥. ساڵێك حاجی سەعیدئاغای سولەیمانی و حاجی قادری روغزایی و حاجی مارفێکی مکایلی؛ سەفەری حەج یەکیان ئەخا و پێکەوە ئەچن بۆ حەج. لە عەرەفات و تەوافیشا هەر پێکەوە ئەبن

و لێك جیا نابنەوە.

کە ئەگەنە بەر کەعبە، حاجی سەعیدئاغا قوڵفی کەعبە ئەگرێ و ئەڵێ: «خوایە لە شوکرانەی ئەوە کە منت گەیاندە ئەم شوێنە، چوار دووکان لە دووکانەکانم کە لەناو قەیسەرییەکەدان خێری مەولوودی پێغەمبەر بێ، کە چوومەوە بیفرۆشم و پارەکەیان بکەم بە خێر».

حاجی قادری روغزایی کە چاوی بەو ئەکەوێ ئەمیش قوڵفی کەعبە ئەگرێ و ئەڵێ: خوایە لە خۆشی ئەوەدا کە گەیشتمە ئەم شوێنە موبارەکە سی سەر مەڕ لەو ڕانەم کە مەڕە پەرەکەی تێدایە خێری مەولوودی پێغەمبەر بێ. هەر کە چوومەوە بە زیندوویی هەر یەکەیان بدەم بە یەکێ.

حاجی مارفیش کە سەیر ئەکا هاوڕێکانی ئەم نەزر و خێر و خێراتەیان کرد، ئەمیش ئەچێ قوڵفەکەی ئەگرێ و ئەڵێ: «خوایە من نە دووکانم هەیە بیکەم بە خێر، نە مەڕی ناو ڕانی شوانکارم هەیە دەست بکەم بە وادەی درۆودەلەسە لەگەڵت. من هەم و نیمە فاتەی دایکی مناڵەکان، هەر لە ئێستەوە هەر سێ تەڵاقی فاتەی دایکی مناڵەکانم بە مەولوودی پێغەمبەرا!. چاوت لێیە خوا؟ تەگبیرم کردن و ترم وڕین! تۆش ئاگات لە حەساوی خۆت وێ!».

١٤٦. خەلیفەیەکی «کربچنە» هەبوو، ساڵێ هاتوچۆی ئەو وڵاتی موکریانەی ئەکرد بۆ کۆ کردنەوەی حاسڵات بۆ تەکیە. لە ئەنجاما لە خەلیفەتییەوە ناوی خۆی نایە شێخ و بوو بە شێخ. مەلا ئەحمەدی «هەبەکی»ـش هەبوو، ڕۆژێك لە مەجلسی شێخا پێکەوە دائەنیشن. شێخ بۆ ئەوەی بە تەواوی بەو ناوچەیە تێبگەیەنێ کە شێخایەتی ڕاستە، ڕوو ئەکاتە مەلا ئەحمەد و ئەڵێ: مامۆستا خوان تەعالا لە قوعانا باسی

شێخی فەرمووە؟ ئەڵێ: بەڵێ. لە چ شوێنێکا؟ ئەڵێ: «لەگەڵ عولەمادا، لەو شوێنەدا کە ئەفەرمووێ: ﴿هَلْ يَسْتَوِي ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾. شێخ دەستێ بە ڕیشیا دێنێت و ئەڵێ: «الحمدلله»!.

١٤٧. لە سنە کابرایەکی جوولەکە موسڵمان بووبوو؛ بە دەفەوە بەناو شارا ئەیانگێڕا و بە دەوریا زیکریان ئەکرد. لەو کاتەدا جوولەکەیەکیتر بەوێدا تێپەڕی؛ چوو سەری نایە بناگوێی و پێ وت: «بەڕاستی موسڵمانەکان زۆر کەم بوون، تۆش چوویت موسوڵمان بوویت؟ محەممەد دڵی خۆشە ئۆمەتی هەیە؟»!

١٤٨. زەمانی دارۆغە بوو، کوڕێکی گاوری جوانکەلە لە «پاتاق» چوو موسوڵمان بوو. مامۆستا فەرمووی: خەتەنەی بکەن. دارۆغە خۆی لێ خۆش کردبوو، کەوتە شەوێ ئێشەکەی دروست کرد.

لە بەیانییا باوکی کوڕەکە تووشی کوڕەکە بوو وتی: ها کوڕم، موسوڵمانەکانت چۆن چاو پێ کەوت؟ وتی: «بابە قەومێکی سەیرن، هەرکەس بچێتە سەر دینی ئەوان بە ڕۆژ کێری ئەبڕن و بە شەو قنگی ئەدڕن!».

١٤٩. کابرایەك هەبوو لە سنە «میرزا فەقێ»ـی ناو بوو، پیاوێکی بەدین و لەخواترس و فەقیرۆکەش بوو. ڕۆژێك ئەچێتە لای مەلا ئەحمەدی قیامەتی (کە ئەم مەلا ئەحمەدە مزگەوتێکی هەبوو لەناو بازاڕەکە بوو) بە ڕۆژ لە بەرهەیوانی مزگەوتەکە دائەنیشت و خەڵك ئەچوون پرسی شەرعیان پێ ئەکرد.

ئەڵێ: قوربان من هەرچەندە نوێژ دائەبەستم و ئەچمە ناو نوێژەوە شەرع شەرمی بۆ نییە کێرم هەڵئەستێ! نازانم چارم چییە؟ ئەویش ئەڵێ:

فیکر لە مردنی باوك و دایکت بکەرەوە. ئەڵێ: کەڵکی نییە. ئەڵێ: هەناسەی خۆت بخۆوە. ئەڵێ: کەڵکی نییە. ئەڵێ: فیکری قەبر و قیامەت بکەرەوە. ئەڵێ: کەڵکی نییە. ئەڵێ: ئەمانەم هەموو کردووە هیچ کەڵکی نییە، تەنانەت فیکرم لە ئاغای قیامەتی کردگەسەوە هەر سوودێکی نییە.

مەلا ئەحمەد تۆزێ ڕائەمێنێ و تێك ئەچێ و ئەڵێ: «کەواتە وەرە کابرا، وەرە بیسوو بە قنگی منا». کابراش ئەڵێ: «قوربان ئاخر من بۆچە هاتگم بۆ خزمەتی جەنابت؟ بۆ ئەوە هەرچی جەنابت بفەرمووی من وا بکەم!».

١٥٠. کابرایەك هەبوو لە «بالیسان» زۆر فەقیر بوو. ئەگەر جارجار لە ئاوایی گۆشتیان بکوشتایەتەوە هەندێ لە ڕیخۆڵە و ورگەکەیان بۆ ئەبرد بۆ ئەوەی بیکەن بە چێشت و بیخۆن. پشیلەیەك پێیان فێر بووبوو ئەهات لێی ئەدزین.

ڕۆژێك کابرا چوو بۆ هەولێر، بە هەرجۆر بوو «بیور»ێکی هێنا بۆ ئەوە جارجار کۆڵە دارێکی پێ بکا و بیدەن بە شتێك و پێوە بژین. کە بیورەکەی هێنا، ژوورێکیان هەبوو لە پشتەوە بردی لەوێ داینا و توند دەرگاکەی پشت کۆڵ کرد لە سەری. ژنەکەی وتی: ئەوە بۆچی بیورەکەت بردە ئەوێ؟ کابرا وتی: تا پشیلە نەیدزێ. ژنە وتی: پیاوەکە پشیلە چۆن بیور ئەدزێ؟! وتی: «چما تۆ ئەقڵت هەیە؟ ئەو گرتکە گۆشتێك کە چوار پوول ناهێنێ ئەیدزێ، هەنووکە بیورێك کە دە قڕان دێنێ کوو نایدزێ؟»!.

١٥١. حاجی ئەحمەدی کڕنوو لە ئاخری عومرەوە تووشی کۆڵنجێك بووبوو، زۆر لە بەری ناڕەحەت بوو. حەکیمەکانی ئەو دەورە وتیان: خوێنی بگرن چاك ئەبێتەوە. خوێنیان گرت کەڵکی نەبوو. یەکێکی تر وتی: ڕۆن گەرچەکی بدرێتی چاك ئەبێتەوە. ڕۆن گەرچەکیشیان دایە

هەر کەڵکی نەبوو. یەکێکی‌تر وتی: ئەگەر شەرابی بدرێتێ بێگۆمان چاك ئەبێتەوە. هەرچەند ڕازیش نەئەبوو، بە هەرجۆر بوو نەختێ شەرابیشیان دایە، کەچی ئەویش هەر کەڵکی نەبوو. دوای ئەوە لێیان پرسی: حاجی چۆنی؟ وتی: «چۆن بم؟ لەم ئاخرەوە بە عومرێکی هەشتا و پێنج ساڵییەوە ئەبێ بە سەرخۆشی و بە قنگ‌دڕاوی بچمە حوزووری خوا!»

.۱۵۲ جارێك کابرایەکی خورڕخوڕەیی زۆر ناشیرینی زۆرخۆر، بۆ سەپانی ڕێی ئەکەوێتە وڵاتی بانە و ئەچێتە دیواخانی حەمەخانی بانە. لە کاتی نان خواردنا کابرا شانی لێ توند ئەکا و دەست ئەکا بە خواردن. (لەو وڵاتی کوردەوارییە سەپان بە خواردن تاقی ئەکەنەوە، ئەگەر زۆر بخوا ئەوە ئیشکەر و سەپانی چاکە) بەڵام خواردنی ئەم کابرایە لە وزە دەرچووبوو، وای لێ هاتبوو حەمەخان چووبووە سەیری. لەو کاتەدا حەمەخان لێ پرسی: کابرا تۆ خێزانت چەندە؟ ئەڵێ: قوربان نۆ کچم هەیە. ئەڵێ: ئەوان جوانترن یا تۆ؟ ئەڵێ: «قوربان من لەوان جوانترم، بەڵام ئەوان لە من زۆرخۆرترن!»

.۱۵۳ حاجی مەلا یووسفی سووورداشی وەختێ قازی بوو؛ ڕۆژێك ئافرەتێك ئەچێتە لای شکات لە دەست مێردەکەی ئەکا ئەڵێ: لە شوێنێکی زۆر تەنگا داینـاوم، لەبەر ئەوە دڵم تەنگە. ئەویش ئەڵێ: «ئیشێکی زۆر چاکی کردووە شوێنی ژنان هەتا تەنگتر بێ باشترە!»

.۱۵٤ «إعزاز المُلك»ی گەورە لە سنە؛ جارێك کابرایەکی مایندۆڵی ئەچێتە شار و ئەچێتە لای ئیعزازولمولك لە خەسراوا؛ کۆشك و باخ و باخاتی خەسراوا و خزمەتکار و تەنتەنەی ئیعزازولمولك سەرسامی ئەکا.

ئیعزازولمولك ئەیەوێ سەر بنێتە سەری و پێی ئەڵێ: حەز ئەکەی وەکوو من بی و مایندۆڵی بی و ئیعزازولمولك بی؟ ئەڵێ: نەوەڵڵا. ئەڵێ: حەز ئەکەی مایندۆڵی بیت و لە بەهەشتا بی؟ کابرا تۆزێ ڕائەمێنێ و پاشان ئەڵێ: «بەڵێ، بەو شەرتە ئەهلی بەهەشت نەزانن من مایندۆڵیم». «اِعزازُ المُلك» دەست ئەکا بە پێکەنین. (مایندۆڵ: گوندێکە لە وڵاتی سنە زۆر بەئاقڵ ناویان دەرنەکردووە!)

١٥٥. حەسەن‌بەگی عەلی‌بەگ بۆی گێڕامەوە وتی: حەمەی سانەحمەد هەبوو وەختێ لای من بوو، ڕۆژێك لە بازاڕی بەغدادا پێکەوە بە ڕێگادا ئەڕۆیشتین. تەماشا ئەکەم هەر لە خۆیەوە ئەڵێ: «باڵەك، باڵەك». وتم: ئەرێ کوڕە حەمەی سانەحمەد ئەوە بۆچ وا ئەکەی؟ وتی: «حەسەن‌بەگ ئەوە نییە حەماڵەکان هەر ئەڕۆن و ئێژن باڵەك. ئەگەر وا نەبوایە نەیانئەوت». وتم: برا ئەوان حەماڵن و هەریەکە کۆڵێکی قورسیان لە کۆڵە و لە ژێر بار ئەنقێنن، تۆ چیت بە کۆڵەوەیە؟ وتی: «برا حەسەن‌بەگ، ئەگەر هەر نقەوێ منیش ئەنقێنم و واز لە باڵەك نایێنم».

١٥٦. مستەفابەگی کەریم‌بەگی جاف و مەحموبەگی ڕەزابەگ ـ کە خزمی یەك بوون ـ بە ترۆمبێلێك لە کەلارەوە دێن بۆ خانەقی. پیاوێکیشیان لەگەڵا ئەبێ، سپلۆتێکیش هەر لە ترۆمبێلەکەدا ئەبێ.

لە ڕێگادا مستەفا بەگ دەست ئەکا بە هۆرە کردن ـ بە قسەی عەلی‌بەگی ڕەزابەگ دەنگیشی زۆر ناخۆش ئەبێ ـ هەر کە ئەو دەست ئەکا بە هۆرە کابرای پیاوە کە لەگەڵیان ئەبێ خورخوڕ ئاو بە چاویا

دێتە خوارەوە. مەحمووبەگیش هەر ئەڵێ: مستەفابەگ بەسیە بیوڕەوە مستەفابەگیش هەر نایبڕێتەوە.

لە ئەنجاما مەحمووبەگ ئەڵێ: «مستەفابەگ تۆ ڕەنگبێ گریانی ئەم کابرایە دەستی بڕیبێت و وا بزانی لەبەر دەنگخۆشی تۆ دەستی کردووە بە گریان؟ وا نییە بەو سەی خەلیلە لەبەر ئەوە ئەگری ئێژێ: جا ئەمە هەر لێرەوە تا خانەقی من گوێم لەم دەنگە ناخۆشە بێ، خۆ پێشەکەشم ناچێتە خانەقی!». ئیتر مستەفابەگ بێدەنگ ئەبێ.

**١٥٧.** لەو کوێستانی دەوری سەردەشتە پیاوێك هەبوو «ماموەیسە»ی ناو بوو. ڕاوچییەکی زۆر بەکار بوو؛ زۆرتر بۆ ڕاوەپڵنگ ئەچوو. بەڵام ئەو دەردەی هەبوو کە ئەچوو بۆ ڕاوەپڵنگ ئەینرکان و ئەترِی. پێیان ئەوت: ماموەیسە بۆچ ئەنرکێنی و ئەترِی؟ ئەیوت: «ئەنرکێنم بۆ ئەوە پڵنگەکە بترسێ، بەڵام قسەی خۆمان بێ خۆیشم ئەترسم بۆیە ئەترِم!».

**١٥٨.** ئەحەی کرِنوو جارێك گەڕ بە کابرایەکی شارباژێڕیدا ئەئاڵێنێ، بارە مێوژێکی لێ لائەدا. ئەبێ بە هەرایان و ئیشیان ئەکەوێتە شکات و شکاتکاری، ئەچن بۆلای قازی. حاجی ئەحمەد بەستووگەیەك پڕ ئەکا لە توێکڵەگوێز و سەرەکەی پڕ ئەکا لە ڕۆن و ئەیبا بۆ قازی. قازی کووپەڵەڕۆن ئەبینێ، بەلای حاجی ئەحمەدا دائەتاشێ و پسوولەی ئەداتێ کە ئەم حەقە هی حاجی ئەحمەدە.

حاجی ئەحمەد لێئەدا ئەڕوا و بارە مێوژی شارباژێڕی ئەخوا. زۆری پێناچێ قازی تێئەگا کە کووپەڵە چی تێدایە. ئەنێرێتەوە بەشوێن ئەحەیکرِنوودا کە پسوولەکە بێنێتەوە سەهوێکی تێدایە بۆی چاك کەم. ئەحەیکرِنوویش وەڵامی بۆ ئەنێرێتەوە ئەڵێ: «سەهوو لە پسوولەدا

نییە، ڕەنگبێ سەهوو لە کووپەڵەکەدا بێ! با هەر لە گوپی بدا».

١٥٩. زەمانی شیر و تیر بوو. کابرایەکی کوردی «بالەك»ـی کەمانێکی ڕووتی هەڵگرت و وتیان: لەگەڵ «داسنی»ـیەکانا شەڕ ئەکرێ. چوو بۆ ئەو شەڕە. پێیان وت: کەمانی بێ تیر چی لێ ئەکەی؟ وتی: تیر لەلایەن دوژمنەکانەوە دێت، هەڵی ئەگرم و ئەیخەمە کەمانەکەوە شەڕی پێ ئەکەم. وتیان: جا ئەگەر نەهات؟ وتی: «ئەگەر نەهات ئەوە ئیتر شەڕ نییە!».

١٦٠. مەلا شەفیع هەبوو لە «عەنبار» لەگەڵ کوێخاکەدا بەینی ناخۆش بوو، پاش ماوەیەك کوێخا مرد. بە مەلا شەفیعیان وت: وەرە تەڵقینی بخوێنە. وتی: «بچن یەکێکی‌تر بێنن تەڵقینی بخوێنێ، ئەو قسەی من ناچێ بە گوێیدا!».

١٦١. فەقێ‌شێتە هەبوو، جارێك مەحمووپاشا پێی ئەڵێ: «ئەرێ فەقێ‌شێتە شەڕ لە بەینی خەڵکا چۆن پەیدا ئەبێ؟ فەقێ‌شێتە ئەڵێ: «پاشا نەیبینی و نەیخۆی!». مەحمووپاشا ئەڵێ: کوڕە چ گوویەك ئەخۆی؟ ئەڵێ: «پاشا وایە، یەکێك گوویەك ئەخوا و ئەوی‌تر جوابی ئەداتەوە، ئەوە شەڕ لە بەینیانا پەیدا ئەبێ». مەحمووپاشا هیچ، ئیتر دەست ئەکا بە پێکەنین.

١٦٢. شێخ جەلالی برای شێخ نەجیبی قەرەداغی ئێوارەیەك مانگی ڕەمەزان لە سولەیمانی لە مزگەوتەکەی خۆیا وەعزی ئەدا و لەلایەن خراپەی عەرەق‌خواردنەوە قسەی ئەکرد ئەیوت: «هەرکەسێ بە سەرخۆشی بمرێ و بە سەرخۆشی کفن بکرێ و بە سەرخۆشی بنرێتە

قەبرەوە...» تا هات ئەویتری تەواو کا، عەزیزبەگ هەبوو لە کۆڕی وەعزەکەیا هەستا وتی: «بەخوا یا شێخ ئەوە عەرەقێکە هەر قاپێکی سەد ڕووپیە دێنێ!».

١٦٣. ئەحەی کڕنوو هاتە سەروبەری مردن وتی: کوڕینە! وەسیەتم ئەوەیە: بە پەلە بچن لەناو شارا چی کۆنە و مۆنە هەیە بیهێنن و بیکەنە بەرم با بەو جلە کۆنانەوە بمرم. وتیان: حاجی ئەحمەد ئەمە بۆچی؟ وتی: «بۆ ئەوە ئەگەر ئەنکیر و مونکیر لە قەبرەکەدا هاتنە سەرم، با وا بزانن من مردووێکی کۆنم هی تازە نیم!».

١٦٤. حەمەپاشای جاف ئەوەبوو هەموو جاف لە ژێر حوکمیا بوو، خۆیشی زۆر بە گەورەیی و خۆشی ڕای ئەبوارد. کە ئەکەوتە جەژنەکان، هەر خزمەتکارێکی لا هەبوو سەر و دەستەجلی بە ناوی جەژنانەوە بۆ ئەکردن.

ساڵێك جەژنی قوربان بوو، باوکی فەقێ شێتەش هەر لای ئەو بوو. حەمەپاشا بۆ هەریەك لە خزمەتکارەکان دەستەجلێك ئەکا. ئەمر ئەکا کورتانێکیش بە ناوی جەژنانەوە ئەدەن بە باوکی فەقێ شێتە.

ڕۆژی جەژن پاش نان خواردنی جەژن، دیواخان پڕ ئەبێ لە خزمەتکار و سەرکۆمار کە هەموو هاتوون بۆ جەژنەپیرۆزەی پاشا. خزمەتکاریش هەریەکە دەستەجلی نوێی خۆی لە بەر کردووە. باوکی فەقێ شێتەش نقەنق ئەنیشێ بە کورتانەوە و ئەیکاتە کۆڵی و ئەچێ بۆ دیواخان، لە ژێر دەواری هەژدە هەستوونیدا خەڵك هەموو چاویان پێ ئەکەوێ. تا هاتن قسە بکەن ئەم خێرا وتی: «خەڵکینە! لوتفی پاشا لەگەڵ منا لێرەدا دەرئەکەوێ. ئێوە نایزانن پاشا بۆ ئێوە ئەمری دا هەریەکە دەستەجلێکتان

بە ناوی جەژنانەوە لە بازاڕ بۆ بکرن، بەڵام بۆ من جلی تایبەتی خۆی داکەند و کردی بە بەرما!». خەڵکەکە واقیان وڕ ئەمێنێ و حەمەپاشا دەست ئەکا بە پێکەنین.

١٦٥. ژنێك هەبوو لە سنە «فەرەنگیزخانم»ی ناو بوو. حەو مێردی کردبوو، هەموویان مردبوون. کابرایەك هەبوو «ئۆسا فەتێ»ی ناو بوو، ئەو مارەی کرد. ئۆسا فەتێیش هاتە سەروبەری مردن. جا فەرەنگیزخانم لە ژوور سەریەوە دانیشتبوو ئەگریا، ئەیوت: «باوانەکەم! ئاخر کە تۆ ئەڕۆی من بەکێ ئەسپێری؟» ئۆسا فەتێیش وتی: «بە قورمساغی نۆیەم!».

١٦٦. ئەحەی کرنوو وەکوو شەربەتی ئەفرۆشت، جارجاریش قەسابی ئەکرد. ڕۆژێك مەڕێکی سەربڕی، بەڵام مەڕ ئەوەندە لاواز و بێ‌فەڕ بوو گۆشتەکەی نەئەخورا و کەس لێی نەکڕی بە دەستیەوە داما.

مەلا ئەحمەدی کانی‌گۆمەیی هەبوو لەو سەردەمەدا لە سولەیمانی مردووی ئەشۆرد. ئەحەی کرنوو هەستا چووە لای وتی: «مەلا ئەحمەد من پیر بووم و ئەترسم لە ناکاوا بمرم، هیچ ئومێدێکم بە کوڕەکانم نییە. هەر لە ئێستەوە کفن و قەبر و هەموو شتێکم بۆ خۆم حازر کردووە، ماوەتەوە سەر شۆردنەکەم. وەرە مەڕێکی بریانم سەر بڕیوە ئەتدەمێ بۆ خۆت، لەگەڵ مناڵەکانتا بیخۆ لەباتی هەقی شۆردنم، بەڵام هەر کاتێ مردم ئیتر مەیەڵە کوڕەکانم توخنم کەون، خێرا وەرە بمشۆ». مەلا ئەحمەدیش شتی وای لە خوا ئەوێ، چونکە زۆر خۆڕاییە! هەستا چوو لاشە مەڕی هێنا و لە ماڵەوە دەستیان کرد بە خواردنی.

نزیکەی بیست ڕۆژێکی پێ‌چوو ئەحە چوو بەلای مەلا ئەحمەدەوە

وتی: مەلا ئەحمەد کاسبییەکە لێرە ناچێ بەڕێوە، ئەچم بۆ کەرکووك، لەگەڵم وەرە با بچین بۆ ئەوێ. مەلا ئەحمەد وتی: من ئیشم چییە بە کەرکووك؟ وتی: برا وەختی خۆی من تۆم بە کرێ گرت کە مردم بمشۆی و ئیتر پێویستم بە یەکێکی‌تر نەبێ؛ هەقەکەشتم لە پێشەوە پێ‌داوی و هەر ئەبێ لەگەڵم بیت، بەڵکوو من لە کەرکووك مردم!.

لەم قسەیەك و لەو قسەیەك، بوو بە هەرایان. خەڵکوخوا کەوتنە بەینەوە و لە ئەنجاما هاتە سەر ئەوە کە مەلا ئەحمەد پارەی مەڕەکە بداتەوە بە حاجی ئەحمەد. حاجی ئەحمەدیش قەبووڵی نەئەکرد. بەڵام خەڵکەکە ڕوویەکی زۆریان لێ‌نا، ئەمجا پارەی بەرانێکی لێ سەند و مەلا ئەحمەد بە هەرجۆر بوو ڕزگاری بوو لە دەستی!.

**١٦٧.** ئەوڕەحمانی خامە لە سولەیمانی، ساڵی سەرما و بەفرە زۆرەکە میوانێکی خەڵکی ئەو شارەزوورەی بۆ پەیدا ئەبێ. شەوێ زۆر سارد ئەبێ، کابرا ئەڵێ: خاڵە ئەوڕەحمان فرە ساردە شتێك نادەی وە سەرما؟ خاڵە ئەوڕەحمانیش هەڵئەستێ حەسیرە شڕێك لەو ناوەدا ئەبێ پیا ئەدا. پاش تۆزێك کابرا ئەڵێ: بەخوا کاکە ئەوڕەحمان هەر فرە سەرمامە، بەڵکوو لێفەیەکی‌ترم پیا دەی. کاکە ڕەحمان پەیژەیەك لەو ناوەدا ئەبێ پەیژەکەش لەباتی لێفە لە سەری دائەنێ.

کابرا ئەکەوێتە چۆقەچۆق ئەڵێ: کوڕە بێ‌فەڕ، کوڕی خامە سنەیی! مردم لە سەرمانا لێفەیەکی‌ترم پیا دە. ئەمجا هەڵئەستێ ئەو ڕۆژە ماڵی دراوسێ هاتبوون جلیان شتبوو سوێنەکە هەروا پڕی بوو لە ئاو، سوێنە هەڵئەگرێ و لەسەر پەیژەکەی دائەنێ. کابرا ئەکەوێتە جووڵەجووڵ سوێنە وە پەیژەکەوە ئەلەرێتەوە و ئاوەکەی ئەڕژێتە سەر حەسیرەکە،

لەسەر حەسیرەکەوە دڵۆپ دڵۆپ بەرئەبێتە سەر کابرا. کە ئەمە ئەبینێ لای وایە عەرەقی کردۆتەوە ئەڵێ: «خاڵە ئەورەحمان عەرەقێکی فرەم کردگەسەوە پیاگەتیت بێت لێفە سەرگەکەم لەسەر لاوە فرە حاڵم خراوە!».

١٦٨. حاجی ئەحمەدی کڕنوو ئەچێتە بناری هەورامان و لەوێ کابرایەك دێتە لای ئەڵێ: برا تۆ حەکیمی؟ ئەڵێ: ئەرێ. ئەڵێ: برا من مووی ڕیشم ژان ئەکا. ئەڵێ: چیت خواردووە؟ ئەڵێ: نان و یەخ. ئەڵێ: بچۆ بۆ خۆت گۆڕبەگۆڕ بە، نە دەردەکەت لە دەردی خەڵك ئەکا نە نەخۆشییەکەت[1].

١٦٩. مامۆستا «بەشیر موشیر» پیاوێك لە شەقڵاوە بڕیاری پێ دابوو کە کچەکەی خۆی بدا بە کوڕەکەی. ئەمیش لە بەغداوە «شامل»ـی کوڕی هەڵئەگرێ و ئەچن بۆ شەقڵاوە بۆ خوازبێنی و گواستنەوەی کچ. دیارە کوڕە و باوك هەردووکیان خۆیان ڕێکوپێك و تاسولووس ئەدەن. لەوێ کچەکە لە کوڕەکە مارە ئەکەن. لە دەمەدەمی گەڕانەوە و گواستنەوەدا مامۆستا و باوکی کچە لەسەر تۆزێ وردە پیتاك بەینیان تێك ئەچێ. مامۆستا هیچ سێ و دووی لێ ناکا ئەڵێ: «بڕۆ هەر سێ تەلاقی کچەکە کەوتبێ!». شاملیش بە تەواوی دڵی لە قەد و باڵای کچە چووبوو، ئەوا بە تەمایە کچ سوار بکرێ و بگەڕێنەوە. باوکی پێ ئەڵێ: هەستە ڕۆڵە با بڕۆین، ئەڵێ: ئەی کچەکە؟ ئەڵێ: کچەم تەلاق دا! هەستە با بڕۆین. ئەڵێ: بابە کچ ژنی منە، تۆ چۆن تەلاقی ئەدەی؟ ئەڵێ: «هەستە هەتیو ئەم ناجسنانە لەوانە نین خزمەتیان بکرێ. ئەوە دەردیان بێ با بڕۆین

[١. پێ‌نەچێ ئەمە هەڵە بێ. دروستەکەی ئاوا بێت: «نە خواردنەکەت لە خواردنی خەڵك ئەکا نە نەخۆشینەکەت». (هەڵەگر).]

کچەکەیانم تەڵاق دا». هەرچەندە شامل هاوار ئەکا کەڵکی نابێ هەر ئەڵێ: تەڵاقم داوە با بڕۆین. شاملی قوڕبەسەری خۆ تاس و لووسدەری بۆ تازە زاوایی، بە هەناسە ساردی لەگەڵیا ئەگەڕێتەوە بۆ بەغدا.

١٧٠. مامۆستا دەروێش عەبدوڵڵای جەباری هەبوو لە مەدرەسەی «ئیسیك»ـی کفری مودیر بوو. هاتوچۆ لە بەینی بەغدا و ئەوێدا بە شەمەنەفەر بوو. ڕۆژێك لە بەغداوە ئەچێتەوە بۆ ئیسیکی کفری، لەناو شەمەنەفەرەکەدا لەگەڵ پیاوێك ئەبن بە ڕەفیق و ڕێگای شەمەنەفەر بە قسە ئەبڕن. زۆرتر لە قسەکانی دەروێش ئەوە ئەبێ کە قسە بە تاڵەبانی ئەڵێ و لەسەر ئەو شێوەیە ئەڕۆن تا ئەگەنە ئیستگەی کفری و لەوێ هەردووکیان دائەبەزن. لەوێدا دەروێش لێی ئەپرسێ: برا من و تۆ یەکتریمان نەناسی؟ کابراش ئەڵێ: برا من لە عەشیرەتی تاڵەبانیم. دەروێش واقی وڕ ئەمێنێ و هیچی بۆ نامێنێتەوە ئەڵێ: «هەی ناجسنی خوا گرتوو! تۆ کە تاڵەبانیت بۆچ زوو دەنگت نەکرد تا من ئەم هەموو جنێوەم نەدایە؟» بەمە ئیشەکەی خۆی پینە ئەکا و هەردووکیان دەست ئەکەن بە پێکەنین.

١٧١. لە دەوروبەری هەولێر مەلا عەبدوڵڵا دێرەبروشەیی هەبوو؛ ئەمە ئیشی هەر ئەوە بوو «مارەبەجاش»ـی ئەکردەوە. ئەوەش کە ئەیکرد بە جاش «مام‌وسوو» ناوێك بوو. جا ئەم مام‌وسووە هەروەخت تووشی مەلا عەبدوڵڵا ئەبوو ئەیوت: مامۆستا قسەیەکم هەیە بیرێم یا نەیرێم؟ ئەویش ئەیوت: بیڵێ. ئەیوت: «مامۆستا ڕاستی هەروەخت تووشی تۆ ئەبم کێرم هەرئەستێ». ئەویش ئەیوت: تف کەرە، جا وەرە پیاوەتی لە گەر بکە.

١٧٢. کابرایەك هەبوو لەو سەرشیوە نەخۆش کەوت و ئامۆژگاری ژنەکەی ئەکرد وتی: ئافرەت کە مردم مێرد بکە بە مامۆسووی دراوسێمان. ئافرەتەکە وتی: بۆچی؟ وتی: «ئەو بێ‌فەڕە جارێك مانگایەکی پێ فرۆشتم هەر زۆر زۆر بێفەڕ بوو؛ هیچ کەڵکی نەبوو. ئەمەوێ تۆڵەی لێ بکەمەوە!»).

١٧٣. مەلا مۆمنێکی جوانڕۆیی هەبوو ژنێکی هەبوو «خافاتم»ـی ناو بوو. خافاتمیش هەر خوێندبووی. خافاتم هەرکاتێ نانی دائەنا مەلامۆمنی مێردی پێ ئەوت: خافاتم سەرت ڕووت کە. کە ئەو سەری ڕووت ئەکرد ئەمیش سوورەی «قل هو الله»ی ئەخوێند. خافاتم ڕۆژێك وتی: ئەرێ پیاوەکە ئەوە بۆچ کە من سەر ڕووت ئەکەم تۆ «قل هو الله» ئەخوێنی؟ ئەویش وتی: «خافاتم لە حەدیسی شەریفدا دیومە ئەفەرمووی: کە ئافرەت سەری ڕووت کرد ئیتر مەلایەکە نایەتە ئەو شوێنە. کە سوورەی «قل هو الله»ش خوێنرا لە هەر شوێنیك، شەیتانیش ناچێتە ئەو شوێنە. جا لەبەر ئەوە کە من نامەوێ عەزیەتی هیچیان بدەم، بۆ سەر نان‌خواردن مەلایەکەکە بە تۆ و شەیتانەکە بە خۆم دوور ئەخەمەوە!»).

١٧٤. ئەحەی‌کرنوو لە سولەیمانی کوڕێکی هەبوو نەخۆش کەوتبوو. حەکیم برایمێکی گاور هەبوو چووە لای کە کوڕەکەی بۆ چاك بکاتەوە و پێنج مەجیدی بداتێ. حەکیم برایم هاتە سەر کوڕە و دەرمانی کرد و کوڕە چاك بووەوە، داوای «مز»ەکەی کرد. ئەحەی‌کرنوو وتی: نیمە بتدەمێ. لەم قسە و لەو قسە لە ئەنجاما ئەحە پێی وت: حەکیم برایم ئەمەی پێ ناوێ، نیمە بتدەمێ، بەڵام ڕێگایەکت بۆ دائەنێم کە پێنج مەجیدییەکەتت دەست کەوێ؟ وتی: چییە؟ وتی: خواجە شەلەمۆ هەیە

لە جووەکان، خۆیشت ئەیناسی، بچۆ شکاتی لێ بکە لەلای قازی بڵێ: پێنج مەجیدیم لەلایەتی. من و کوڕەکەم بکە بە شاهید، دین و شایەتیت بۆ ئەدەین، ئەوا بەو جۆرە پارەکەت دەست ئەکەوێ.

حەکیم برایم چار ناچار ئەچێت وەکوو ئەحە پێ ئەڵێ، شکات ئەکا لە خواجە شەلەمۆ. ئەحەی کرنوو و کوڕەکەی ئەکا بە شاهید. قازی، شەلەمۆ بانگ ئەکا ئاگای لە هیچ نییە بە حەکیم برایم ئەڵێ: شایەتت هەیە؟ ئەڵێ: بەڵێ، ئەحەی کرنوو و کوڕەکەی. شاهید بانگ ئەکرێ و بەم جۆرە پێنج مەجیدی ئەکەوێتە سەر خواجە شەلەمۆ؛ لێی ئەستێنن و ئەیدەن بە حەکیمبرایم و دێتە دەرەوە.

ئەمجا ئەحەی کرنوو سەری ڕێی پێ ئەگرێ، داوای حەقی شایەتی خۆی و کوڕەکەی لێ ئەکا. حەکیم برایمیش ئەڵێ: مامە ئەحمەد حەقی شایەتی چی؟ تۆ کەر بە پیاو ئەگێی و شایەتیمانیشی پێ دێنی. ئەڵێ: کافری بێ دین! ئەی من حەماڵی شەیتانم؟ خەڵکوخوا ئەکەونە بەین تا بە چوار مەجیدی مامەحمەد ڕازی ئەکەن، قیر سپی ئەبێ.

١٧٥. وەستا «گوروون»ـێکی بەرگدروو هەبوو لە سولەیمانی، کەوا و سەڵتەی چاکی ئەدروی. هەباسی مەحمووئاغای پشدەر ئەچێتە سولەیمانی، بە ناوبانگی کەوای وەستا گوروونەوە تۆپێ ماوتی نایاب ئەبا، بۆی بکا بە کەوا و سەڵتە. وەستا کەوا و سەڵتەی بۆ ئەبڕێ، بەلام لەبەر ئەوە کە هەباساغا زۆر بە وردی چاوی تێبڕیوە هیچی بۆ نادزرێ، ناچار وەستا گوروون تڕێك ئەکەنێ. هەباساغا دەست ئەکا بە قاقای پێکەنین و ئەکەوێ بە پشتا، لەو کاتەدا وەستا دەستی خۆی ئەوەشێنێ. هەباساغا پێکەنینەکەی بە لاوە خۆش ئەبێ، ئەڵێ: وەستا تو

سەری خۆت تڕێکی‌تریش، ئەڵێ: «قوربان ئیتر بەسە، نەوەك كەوا و سەڵتەكە تەنگ بێت!».

١٧٦. فەقێ‌شێتە هەبوو، هەڕەتی گەنجی بوو حەزی ئەكرد خۆی بگەیەنێتە لای مەحمووپاشای جاف و لە ئەنجاما ببێ بە پیاوی ئەو. مەحمووپاشا پیاوێكی هەبوو حەمەعەلی ناو بوو. فەقێ‌شێتە حەمەعەلی باش ئەناسی، بەڵام مەحمووپاشای نەئەناسی. حەمەعەلی ئیشێكی وای كرد كە مەحمووپاشا داوای فەقێ‌شێتە بكا و بە حەمەعەلی وت: بچۆ بیهێنە. حەمەعەلی چوو بە فەقێ‌شێتەی وت: كە شەوێ پاش بانگی شێوان وەرە مەحمووپاشا داوات ئەكا، چاوت پێ بكەوێ. فەقێ‌شێتە ئەمەی زۆر پێ‌خۆش بوو، پاش بانگی شێوان چوو بۆ دیواخان. وا ڕێ كەوت كەس لە دیواخان نەبوو تەنها مەحمووپاشا خۆی و حەمەعەلی نەبێ. فەقێ‌شێتە كە چووە ژوورەوە ڕووی كردە حەمەعەلی وتی: «ئەرێ حەمەعەلی كامتان مەحمووپاشان؟»!.

١٧٧. كابرایەك هەبوو لە سولەیمانی «خەپە»یان پێ ئەوت؛ كابرایەكی شێتی بەهێزی هەتا بڵێی زل بوو. كفتەی سولەیمانی بەناوبانگ بوو، ژنان لە ماڵان خەپەیان بانگ ئەكرد بۆ ئەوە گۆشتی كفتەیان بۆ بكوتێ. خەپەش بە تەمای كفتە خواردن سەری بە هەموو ماڵێكا ئەكرد. ژنان كە خەپە بەو شان و قۆڵەوە گۆشتەكەی بۆ ئەكوتان، ئەوانیش داودەرمانیان تێ ئەكرد و ئەیانخستە سەر مەنجەڵ بە خەپەیان ئەوت: خەپە زۆر هیلاك بوویت بچۆ تۆزێ بۆ خۆت بنوو بحەسێرەوە. خەپەش ئەیوت: باشە و ئەچوو ئەنوست، تا ئەو لە خەو هەڵئەستا كفتە پرزۆڵیشی نەئەما. خەپە قەت بە عەمری خۆی كفتەیەكی نەخوارد!.

١٧٨. قادری قۆرك هەبوو لە دێی «توولەبی» لە شەمیران. موریدی شێخی «ضیاءالدین» بوو. گێڕایەوە وتی: ئەوا تۆفی کوڕێنیمە، گالۆکێکم کردگە وە مەچەکما چووم بۆ بیارەی شەریف بۆ خزمەتی شێخی گەورە. شەروەت وێ لە ڕووتا هەر گەیشتمە ئەوێ ئیشی پێشاوم هەبوو، چوومە سەر پێشاو. دانیشتم و دانەنیشتم کاورایەك هات بەردەرگاکەی لێ گرتم وتی: ئەها. وتم: ئەها. ئەو هەر وتی و من هەر وتم، هیچ نەچوو وە گوێچکەیا. ئەوەنەم زانی خۆی کرد وە ژوورا. منیش نەمکردە ناپیاوەتی هەر هەڵسام و گالۆکێکم کێشا وە پەشیمانەی ناو شانیا لنگەوقووچ لەوێ کەوت. شێخ -وە قوروانی وم!- چاوی لێ وو وتی: قالە نەی کردوێ؟ وتم: وە قوروان تازە کردم و تێ‌پەڕی، نام وە ڕیشی باوکیەوە؛ گوایە ئەم کاورایە وە تەمای چییەوە وا ئەکا؟!

١٧٩. ساڵێك گۆبەندێك داکەوتبوو لە سولەیمانی نووری ئەحمەدی تاها هەبوو وتی: بە شوێنما ئەگەڕان؛ هاوڕێیەکی دڵسۆزم هەبوو، چوومە ماڵی ئەوان خۆم بشارمەوە. کە چووم دۆستەکەم لە ماڵ نەبوو، پرسیم لە خێزانەکەی: براژن کاکە ئەحە لە کوێیە؟ وتی: کاکە نووری گیان دانیشە ئێستە دێتەوە. وتی: هەر دانیشتم و هەر نەهاتەوە. وتم: براژن دواکەوت، ئەوە بۆچی کاکە ئەحە نەهاتەوە؟ وتی: بەخوا کاکە نووری ئەوێ ڕاستی بێ چووە خۆی بشارێتەوە.

بەلامەوە زۆر سەیر بوو وتم: نەچووبێ بۆ ماڵی ئێمە؟ وتی: نازانم. لە ئەنجاما دەرکەوت ئەویش چووە بۆ ماڵی ئێمە خۆی بشارێتەوە!.

١٨٠. کابرایەکی «کەڵهوڕ» لە ماڵی دنیا خوا ڕیشێکی پان و زمانێکی لووسی پێ دابوو. ڕێی ئەکەوێتە دێی «ئاڵتوون»ـی لای سەقز.

ئاڵتوونی وا مەشهوورە هیچ بە کەس نادەن، وەکوو ئەڵێن: پشیلەی کوێر نان لە ماڵیان دەر ناکا.

ئەم دەروێشـە کەڵهوڕیانە شـێوە قسـەی هەموو لایەك ئەزانن. کاکی کەڵهوڕ کە ئەچێتە ئاڵتوون سەیر ئەکا شاییە، هەرایە و زەماوەندە و زەنایە. لەگەڵ ئەوەشا سەیر ئەکا وا چەند دەروێش و دەرۆزەکەرێکی‌تر لەوێن و دۆش داماون. چووە ناویان وتی: چییە بۆ وا ماتن؟ وتیان: چۆن مات نەبین؟ ڕێگایەکی دوورمان بڕیوە هاتووین بۆ ئێرە، تەماشا ئەکەین ئەم ئاڵتوونیانە هیچمان نادەنێ. وتی: کەواتە چاوتان لە کاکی خۆتان بێ.

کابـرا دەمەوئێـوارە بوو چـووە بەردەمی کۆڕەکـە و خەڵکێکی زۆریـش وەستا بوون، دەنگی بەرز کردەوە وتی:

ئاڵتوونیانـی ئاڵتوونـی      بـاڵا بەرزانـی بیتوێنی
ئەناڵێـن بۆشـاییتان      بـە ئاواتن بـۆ دیتنتان

کـە ئەمـەی وت، هەمـوو خەڵکەکـە وەکـوو پوورەی هەنـگ لێی کۆ بوونـەوە و ئاهەنگیـان چۆڵ کـرد و هاتـن بـەلای ئەمـەوە. ئەمجـا ڕووی تێ‌کردن وتی: خەڵکینە! کردەوەی چاك و ئیشـی باش لە دنیادا جەزای هەیە، وەکوو ئەم خۆشییە کە ئێستە ئێوەی تیان، لە ڕۆژی قیامەتا گەلێ لەمـە خۆشـتر ئەبینـن. ئەوانەی کە خراپەکارن وەکـوو ئێمەی بەدبەخت و ڕوورەشی هەردوو لان.

یەکێك لەو بەدبەختانە کە ئەیانبینن منم، منی بەدبەخت نەومسڵمانم لە ئەولادی ئەو جوولەکانەم کە لەبەر خراپی و نالەباری و خوانەناسی خوا کردنی بە مەیموون. خراپی ئەوان کاری کرد لە وەچە وەچەیان. منی بەدبەخت لەگەڵ ئەوەدا کە بە دینی پاکی ئیسلام سەرفەراز بووم، هێشتا هـەر ماڵ‌ویرانـی و بەدبەختیم بەرکەوتووە. دینی پاکی ئیسـلام هێشـتا بە

تەواوی مشتومالّی نەداوم. نالەباری ڕۆژگار و خراپی چەرخی چەپگەرد وای لە من کرد کە بکەومە دەشت و کێو بۆ ئەوە شتێك پەیدا کەم بۆ ماڵ و خێو. لەبەر ئەوە، بۆ ئەوە لە کردەوەی باوباپیرم ڕزگارم ببێ، ناچارم بە دەربڕینی ئەو بەدبەختیەی کە پێمەوەیە، بەڵکوو خوا بە واسیتەی دینی پاکی ئیسلام و ئیعتراف کردنی خۆم و ئەم شادییە موبارەکەی ئێوە، پاکم بکاتەوە.

کە ئەمەی وت، خەڵکەکە بە تەواوی ڕوویان تێکرد و زۆر سەرسامی ئەم قسە و گفتوگۆیە بوون. وتی: «بەڵام خۆ تازە من بەدبەخت و ماڵویران بووم؛ خۆ تازە ڕووڕەش و شەرمەزاری لای خوا و بەندە بووم؛ خوا دەمێکە پێی زانیوم، ئەوا نەبوونی و پەرێشانی ڕۆژگار ناچاری کردم بەوە کە ئێوەش پێم بزانن».

هەتا ئەم قسانەی ئەکرد خەڵکەکە زیاتر ئەکەوتنە سەر هەوەسی ئەوە کە گوێی لێ ڕابگرن و زیاتر لێی کۆ ببنەوە. وتیان: ئەوە چییە کەوا تۆی وا لێ کردووە؟ وتی: «لە خوا نەترسی و بەدکرداری جوولەکەکانی باوباپیرم کە وەختی خۆی کردنی بە مەیموون، هێشتا لەو میراتە شتێکیش بۆ من ماوەتەوە؛ ئەو شتەش کلکە. ئێستە من کلکێکی درێژم پێوەیە هەریەکە لە پێشا شتێکم بدەنێ لە پاشا پیشانتان ئەدەم!».

ئەمەی وت و عەباکەی ڕاخست. خەڵکەکە کە ئەمەیان گوێ لێ بوو هەر بە تەواوی ئارەزوویان پەیدا کرد بۆ بینینی ئەم شتە سەیرە ڕوو نەداوە، کە تا ئێستە کەس نەیبیستووە و نەیدیوە ئادەمیزاد کلکی هەبێ. پارە و شتیتر وەکوو باران لە ئاڵتوونییەکانەوە باری بەسەر عەبای دەروێشی کەڵهوڕیدا و ئەم قسەیە شڵەژەیەکی دا بە ئاوایی.

پاش ئەوە کە عەبا پارە و شتومەکێکی زۆری تێ چوو، دەروێش سەیری

کرد ئەگەر لەوە زیاتر بوێ، هەڵناگیرێ. چوار چمکی عەبای هێنایەوە یەك و بەستی بە کۆڵیا و شەتەکی دا. لەو کاتەدا کەوا عەبای شەتەك داوە بە کوڵیا، کوتوپڕ زۆر بە سەرساميیەوە وەستا و سەری پەنجەی خستە دەمیەوە و کەوتە بەحرى خەیاڵەوە و ورتەی لە خۆی بڕی. خەڵکەکە وتیان: ئەوە چی بوو؟ بۆچ ئیتر کلکەکەتمان پیشان نادەی؟

وتی: «بیستبووم کە هەموو جار مامۆستا فەرموویەتی: ڕزگاری لە ڕاستیدایە و ڕاستی وتن گوناح ئەشواتەوە. ئێستە کە من ڕاستی ئەم ئیشە نهێنییەی خۆمم بە ئێوە وت و ئیعترافم کرد، سەیر ئەکەم ختووکەیەك بە لەشما هات و هەموو دەمارەکانم لە تەوقە سەرمەوە تا کەڵەمووستی پێم کەوتنە جووڵە؛ وەکوو چۆن شتێك لە شوێنێکەوە بنرێتە شوێنیکیتر هەموو شتەکانی ئەو شوێنە ئاڵوگۆڕیان بە سەرا دێت. لەشی منیش وای لێهات. لەم کاتەدا کە باش تێفکریم ئەبینم ئەوا کلکەکەم لە پاشەوە گوێزرایەوە بۆ پێشەوە ئێستە ئەگەر ئارەزوو ئەکەن تا پیشانتان بدەم.

خەڵکەکە لەم بەسەرهاتە هەموو سەریان سڕما و هەندێکیان کەوتنە بۆڵەو هەندێکیان جنێو و هەندێکیان وتیان: ئیشی خوایە! خوا قادرە بەسەر هەموو شتێکا. کابراش وردە وردە ملی ڕێی گرت و هاتەوە بۆلای سواڵکەرەکانیتر و شەو داهات، پێی وتن: ئاوا شت پەیدا کەن!.

.١٨١ لەو سەرە بێوەژنێك هەبوو کچێکی هەبوو دای بە شوو. خۆی بوو بە «پێخەسوو»ی. شەوێ سەیری کرد: کابرای زاوا سەرینێك ئەنێتە ژێر سمتی کچەکە و ئەو وەختە ئەچێتە لای. ئەمەی بەلاوە سەیر بوو، هەر بە ناوی لەلا مانەوەی کچەوە چەند شەوێك مایەوە و هەموو شەو سەیری ئەکرد کەوا کابرای زاوا سەرینێك ئەخاتە ژێر سمتی کچەکەی و ئەو وەختە ئەچێتە لای. ئیتر لە وزەیا نەما، کە ڕۆژ بووەوە لە کچەکەی

پرسی: ئەرێ ڕۆڵە ئەوە مێردەکەت بۆچی ئەو سەرینەت ئەخاتە ژێر؟ کچە وتی: نازانم دایە، ئەڵێ: بەو جۆرە هەمووی ئەڕوا.

ژنە هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی: ئەو گۆڕبەگۆڕەکەی باوکت سەد گوریس کێری لێ دزیوم، ئۆف ڕۆڵە خوا تۆڵەی منی لێ کاتەوە. ئەبێ ئێستە بچم گۆڕەکەی پڕ کەم لە لاس!.

١٨٢. عەزیزخانی سەردار لە «بۆکان»؛ ڕۆژێك حەمام قۆرخ ئەکەن «زێباخان»ـی کچی ئەچێ بۆ حەمام. ئەنگوسیلەیەکی ئەڵماسی ئەبێ، ئەیدا بە کارەکەرێکی کە لەگەڵیا ئەبێ بۆی هەڵگرێ. کارەکەریش ئەنگوسیلەکە ئەنێتە درزی دیواری حەمامە ساردەکە و تۆزێ مووی ئەدا بە سەرا بۆ ئەوە لێی تێك نەچێ. پاشان زێباخان لە حەمام دێتە دەرەوە و داوای ئەنگوسیلەکە ئەکاتەوە لە کارەکەرەکە. کارەکەر لە بیری ئەچێ کە لە کوێ دایناوە، ئەمە لێرە بوەستێ...

«هۆمەری ملەکەوە» هەبوو لە بۆکان پیاوێکی دەوڵەمەند بوو، دراوسێ ماڵی مامۆستا بوو، خەڵکی هاتوچۆی ماڵی مامۆستایان ئەکرد و شتیان بۆ ئەهێنان؛ باش ڕایئەبوارد. ژنەکەی هۆمەریش وەکوو ئەوان ڕایئەبوارد. ماڵی مامۆستا کە خەرجیان ئەکرد ئەهاتەوە سەری، بەڵام هی ئەمان هیچی نەئەهاتە سەر. ئەوەی کە هەیانبوو دوایی هات. ژنەکەی پێی لێکرد بە کەوشا و وتی: ئەبێ بچی شت پەیدا بکەی. پیاوەش وتی: ئاخر ئافرەت لە کوێ بێنم؟ وتی: وەکوو چۆن مامۆستا نوشتە ئەنووسێ و کتێب ئەگرێتەوە شتی بۆ دێنن، تۆش وا بکە. وتی: ئاخر من هیچ نازانم. ژنە وتی: کەیفی خۆتە، من شتم ئەوێ. هۆمەر بە ناچاری چوو نەختێ کاغەزە شڕی لەناو کۆڵان کۆ کردەوە و پێکەوە دووری و ناوی نا کتێب. چووبوو لە نزیکی حەمامەکەی بۆکانا دانیشتبوو، ئەیوت: کتێب ئەگرمەوە.

لەولاوە کە زێباخان تەنگی بە کارەکەرەکە هەڵچنیبوو بۆ ئەنگوسیلەکە، کارەکەریش لە بیری نییە ئەنگوسیلە چی لێ‌هاتووە، لەبەر پەلەپەلی و شلەژاوی هەر کراسەکەی ئەکاتە بەری و دەرپێکەی لەبیر ئەچێ، دەست ئەکا بە گەڕان. دێتە دەرەوە لە حەمامەکە سەیر ئەکا پیاوێك کتێبێکی لە بەردەمایە کتێب ئەگرێتەوە. ئەچێتە لای بە قنچکانەوە لە بەردەمیا دائەنیشێ، پێی ئەڵێ: کتێبێکم بۆ بگرەوە بزانم ئەنگوسیلەکەی زێبا خانم کێ دزیویەتی؟ کابراش خۆ هیچ نازانێ، سەرباری ئەوە لەبەر ئەوە کە کارەکەرەکە دەرپێی لە پێ نابێ، کابرا لە ژێرەوە چاوی بە وانێکەکەی ئەکەوێ، ئەڵێ: «بەخوا دایکم لە کتێبەکەدا چاوم لە هیچ نییە تەنها کونێك نەبێ سەرەکەی پڕیەتی لە موو».

کارەکەرەکە ئەقیژێنێ و ئەکەوێتە بیری ئەڵێ: «ئای بە قوربانت بم خۆیەتی، دیمەوە». هەڵئەستێ ئەچێ ئەنگوسیلەکە لە کونەکە دەردێنێتەوە و ئەیداتەوە بە زێباخانم. کە دێنە دەرەوە لیرەیەکی حەقی کتێبەکەش بۆ هۆمەر ملەکەوە!. ئیتر هۆمەر ناوبانگ دەرئەکا و لەو ڕۆژە بەدواوە پارەیەکی زۆر ئەڕژێ بە سەریا و ماڵی ئەوان گەلێ خۆشتر ڕایئەبوێرن. جا ژنەکەی پێی ئەوت: ئا پیاوەکە، ناڵێم تەمەڵی مەکە؟ چاوت لێیە بە دوو ڕۆژ چۆن بوویت بە مەلا؟ هۆمەریش خۆی ئەیزانی کوێی ژان ئەکا!.

١٨٣. «مینە عازەباتی» هەبوو، ژنێکی‌تری هێنابوو. ڕۆژێك لەلای دۆست و خزمەکانی بە شان و باڵیا دێت: کە چۆن وا ژنێکی شۆخوشەنگ و نازك و نازدار و بێ‌عەیبە و چۆن ئەو بێ‌عەیبیەی کردوویەتە کارێ کە ئەمەی هێناوەتە سەر ژنە کۆنەکەی؟.

خزمەکانی ئەڵێن: کەواتە بانگێشتنێکمان بۆ بکە و ژنەکەشت ئەبینین. ئەویش ئەڵێ: باشە. بانگێشتنێکیان بۆ ئەکا بۆ ماڵی خۆیان. کورگەل

کە ئەچن و ئافرەتەشیان چاوپێ‌ئەکەوێ، سەیر ئەکەن لە ئەوپەڕی ناشیرینیدایە. لە بەینی خۆیانا ئەکەونە چپەچپ و قسە کردن. مینە ئەزانێ قسە ئەکەن ئەڵێ: بە دەنگی بەرز قسە بکەن، ژنەکەم گوێی کەڕە هیچێ نابیسێت!».

١٨٤. شێخ محەمەدی شێخ جەلال گێڕایەوە وتی: لە «سێوسێنان» لە دیواخانەکەی کوێخا نەجمدا «ئەسکەملی» دانرابوو. ئەسکەملییەکە لە حەیزەرانەکان بوو، کونی زل‌زلی تێ بووبوو. یەکێ لە پیاوەکانی کوێخا نەجم لەسەر یەکێ لە ئەسکەملییەکان دانیشتبوو، تەزبێحێکی بە دەستەوە بوو هەڵی‌ئەسووڕاند. یەکێکی‌تریش لەوبەریەوە لەسەر ئەسکەملییەکی‌تر دانیشتبوو، زۆری پێ‌نەچوو، هات هەستێ کەچی دەستی کرد بە باقەباق و هاوار کردن و بە ئەسکەملییەکەوە ڕاست بووەوە و دانیشتەوە. وتیان: کوڕە چیتە؟ وتی: بێ قەدەوی بێ[!] هەردوو گونم گیری خواردووە بە کونی ئەسکەملییەکەوە. وتیان: جا بۆچی وات کردووە؟ وتی: «کوڕە بێژم چی، خەتای ئەو دەویت باوکەی بەرانبەرم بوو. ئەو تەزبێحێکی گرتبوو بە دەستەوە هەڵی‌ئەسووڕاند، من تەزبێحم نەبوو، گەمەم وە گونم ئەکرد، یەکێکیانم لە دەست دەرچوو کەوتە کونی ئەسکەملییە بێ‌فەڕەکەوە، خەریك بووم ئەوەیان دەرێنم کەچی ئەوی‌تریشیان کەوتە کونێکی تەنیشت ئەوەوە، وا هەردووکیان حاسی بوون بۆم دەرنایەنەوە».

١٨٥. لەو وڵاتی دزەییە بێوەژنێکی تەڕپیر هەبوو لەگەڵ «مام‌عەلا»دا دەستیان تێکەڵاو کردبوو. مام عەلا برایەکی هەبوو مام عالای ناو بوو. ڕۆژێك بێوەژنەکە لەگەڵ مام عەلادا ژوانی شەوێ ئەبەستن، مام

عالاّ ئاگای لێیان ئەبێ. ئەم لە پێش ئەوەدا مام عەلاّ بچێتە سەروەخت ژوانەوە، ئەچێتە لای بێوەژنەکە. دنیاش تاریك ئەبێ لەو کاتەدا کە خەریکی ئیشی خێر ئەبن، ژنەکە هەست ئەکا کە ئەمە مام عەلاّ نییە و مام عالاّیە. ئەڵێ: «بژەنە با مام عەلاّ نەبێ مام عالاّ بێ، بژەنە لە منت نەکەوێ!».

١٨٦. کابرایەکی مایندۆڵی گایەکی هەبوو کاوێژی ئەکرد. چووە بەردەمی پێی وت: گاکە دەمێ لەو جاچکەتە پێم دە بیجاوم». گا هەر گوێی نەدایە و ئەمیش هەر ئەیوتەوە، لە ئاخرا هەڵیکێشایە نووکی نەقیزەکەی و کردی بە ورگی گایەکەدا وتی: «بێفەڕەی باوەحیزە! ئەمە دوانزە مانگە کا و جۆ ئەکەمە بەری کەچی ئێستە دەمەجاچکەیەکم پێ نادا» و نەقیزەکەی هەر لەناو ورگیا بە قەوە هەڵئەسووڕان!.

١٨٧. ئەحەی کرنوو لە سولەیمانی شەربەتی مێوژی دروست ئەکرد. جارێك سێ بار مێوژە ڕەشکەی لە کابرایەکی جاف لە شارباژێڕ کڕیبوو بە نۆزدە تارانی. پارەکەی ناداتێ و ئەڵێ: سبەینێ کە هاتیەوە بۆ هۆڕەکان پارەکەشت ئەدەمێ. لە سبەینێدا کابرا دێتەوە بۆ پارە و هۆڕەکان. خاڵەحمەد هۆڕەکانی ئەداتێ و ئەڵێ: بەخوا فلانی، کیسە پارەکەم لە ماڵەوە بەجێ هێشتووە ناتوانم دووکانەکەشم بەجێ بێڵم، سبەینێ وەرەوە پارەکەشت ئەدەمێ، جارێ هۆڕەکانت بگرە. کابرا ناچار لێ ئەدا ئەڕوا و سبەینێ دێتەوە ئەڵێ: خاڵەحمەد هاتوومەتەوە بۆ پارەکە. ئەڵێ: یاخوا بەخێر بێتەوە ها ئەوە شەربەتێ بخۆرەوە جارێ، پاشان پێی ئەڵێ: بچۆ گوێدرێژ و شتەکەت بێنە و لێرەوە پارە و هەمانەکەت وەربگرە و برۆ. هەمانەکەشی پێ دائەنێ. کە کابرا ئەڕوا ئەم دووکانەکەی بەجێ دێڵێ و ئەڕوا. کابرا بە سێ گوێدرێژەوە لەبەر دووکانەکەدا ڕائەوەستێ و ڕێگای بازاڕەکە ئەگرێ. خاڵەحمەدیش

دیار نییە؛ ئەوا ڕێگاوبانیش کەرەکان گرتوویانە. هەرکە ئەهات دەستی ئەکرد بە جنێودان بە کابرا: کە بۆچی ناو ڕێگاکەی گرتووە. ئەویش ئەیوت: «بۆچی جمێن ئەدەن؟ مێوژم فرۆشتگە وە خاڵەحمەد، پارەکەی نەداگمەسێ، دوێنێ هاتم شەروەتێکی دامێ ـ وە قوزڵقورتم وێ ـ وتی: بەیانی بێرەوە لێرە پارەکەشت وەربگرە و یەکرێ بچۆرەوە. ئەو وتی: کەرەکانیشت بێرا، هەمانەکەشی لێ گل داگمەسەوە، ئەوا ئێستە هاتگم کەچی ئەو لێرە نییە، نازانم بۆ کوێ ملی شکاندگە!)».

ئەمە ئەڵێ و هەچە ئەکا لە گوێدرێژەکانی و بەرەو دوا ئەیانگێڕێتەوە و هەر ئەڵێ: هەچە بکەم وە قنگی دایکی ئەو کاوراوە کە وا لە خەڵکی ئەکا. ئا بێژە کاورا تۆ بۆچی دەستی خەڵکی ئەوڕی!»

ئەو ئەڕوا و ئەحەی کرنوو دێتەوە سەر دووکانەکەی. لای ئێوارە کابرا هەر خۆی تەنیا دێتەوە. خاڵەحمەد ئەچێ بە پیریەوە و خۆی لێ تووڕە ئەکا و ئەڵێ: ئەوە تۆ لە کوێیت؟ لە بەیانییەوە چاوەڕێت ئەکەم هەر دیار نەبوویت. پارەکەم دایە دەست ئەو کوڕە کەبابچییە کە لە بەرانبەرمەوەیە بۆت بێنێ، بچۆ لێی وەرگرە. هەندێ دۆیش ئەکاتە ناو هەمانەکەی و لێوارەکەی ئەدا بە دۆشاوەوە و ئەڵێ: ئەوەش دۆشاوە کردوومەتە ناو هەمانەکە بیبەوە بۆ مناڵەکانت لەو شارەزوورە دۆشاو تاسوخە. کابرا وتی: خوا ڕاوەستاوت کا و لێی دا چوو بۆ دووکانی کەبابچی!.

کە ڕووی کردە دووکانی کەبابچی شاگرد کەبابچی وا ئەزانێ مشتەرییە و هاتووە وتی: فەرموو کاکە. ئەمیش بەبێ قسە چوو دانیشت و دوو لوولە کەواویان لەناو لەواشەیەکا بۆ هێنا وتی: ئەم عەزیەتەت بۆ کێشا و دەستی کرد بە خواردنی. کە لێ بووەوە هەستا چوو بەلای شاگرد کەبابچییەوە، وتی: کاکە پارەکە کە خاڵەحمەد پێی داگی بمدەیتێ، بمدەرێ با بچمەوە

شەو داهات. ئەویش وتی: برا پارەی چی!؟ بێنە پارەی کەبابەکە بدە. وتی: برا پارەی کەبابی چی؟ تۆ خۆت نەتوت: فەرمووو؟!

بەردت لێ وارێ ئاوا میوانداری ئەکەن. کوڕە وتی: کوڕە میوانداری چی و پارەی خاڵەحمەدی چی، بێنە پارەی کەبابەکە. لەم قسەیەك و لەو قسەیەك، بوو بە شەڕیان. یەك دوو شاگردیتریش لێ کۆ بوونەوە دەستیان کرد بە لێدانی و بە داوا کردنی پارەی کەبابەکە. ئەمیش هەر ئەڵێ: کوڕە دەویت‌باوك، پارەکەی خاڵەحمەد کە داگیە پێت بمدەرێ، گوو وە ڕیش باوکتان شاری بۆ خۆتان و میوانداریتان. یەکێ لە شاگردەکان جامانەکەی لە سەر کردەوە و بردی لە باتی پارەی کەبابەکە؛ یەکێکیتریشان هەمانەکەی لە دەست سەند و ماڵی بە سەریا، بۆچ هەمانە دۆوەکە نەڕژێ بە سەر و ڕیشیا. بەم جۆرە لێك بوونەوە و شەو داهات.

کابرا بە سەری بێ جامانە و ڕیشی دۆواوییەوە گەڕایەوە بۆ خانەکە بۆلای وڵاخەکانی. هەر ئەیوت: بکەم وە قنگ دایکتەوە ئەحەیکرنوو هەتا ڕۆژم لێ ئەوێتەوە. لەولاشەوە کە خاڵەحمەد ئەمی بەم جۆرە دەسەسەر کرد، دووکانی خۆی هەڵگرت و چووەوە بۆ ماڵەوە.

بەیانی کە ڕۆژ بووەوە کابرا چووەوە بۆ بەر دووکانەکەی خاڵەحمەد، خاڵەحمەد لە دوورەوە هات بە پیریەوە و دەستی کرد بە جنێودان پێی: وتی: کابرا تۆ بۆ لەناو خەڵکا حەیای منت بردووە، ئەڵێی پارەی خواردووم، پارە کەی ئەخورێ؟ تۆ لوولە کەبابت خواردووە یا من پارەم خواردووە؟ ئەرێ خەڵکینە کەباب ئەخورێ یا پارە؟ ئەرێ ئەوە بۆ لەخواترسێك نییە بێنێ شەرعی من و ئەم کابرایە بکا؟

خەڵکێکی زۆر لێیان کۆ بوونەوە، پاشان خاڵەحمەد وتی: خەڵکینە من سێ بار مێوژم لەم پیاوە کڕی بە نۆزدە قران، وایە یا وا نییە؟ کابرا وتی

بەڵێ واسە. وتی: نۆزدە قرانەکەم دابووە دەست ئەو کورە کەبابچییە بۆی، ئەویش چوو کەبابی خوارد، وتی: کەبابت خوارد یا نەتخوارد؟ وتی: بەڵێ وە قوزڵقورتم وێ! وتی: ئەی ئیتر چیت لێم ئەوێ؟ من پارەم ڕۆیشتووە کەچی تۆش سەرباری دەنگ ئەکەی و ئەڵێی پارەی خواردووم. ئەرێ خەڵکینە ئێوە ئەگەر دینیشتان نییە بۆ خوا قسە بکەن، پارە چۆن ئەخورێ؟ ئێستەش من لەبەر خاتری دۆستایەتی جارێکیتر پارەکەی هەر ئەدەمێ ئەوەی ڕۆیشتووە ڕۆیشتووە، بەڵام بە جارێ ناتوانم بیدەمێ بە سێ جار ئەیدەمێ؛ هەر حەفتەی جارێ. کابرا وتی: باشە.

ئەمجا خاڵەحمەد وتی: حەفتەی یەکەم بەشێکی؛ ئەوە چەندە؟ وتی: ئەوە شەش قران. وتی: حەفتەی دووەمیش شەش قران، ئەوە چەند؟ کابرا وتی: ئەوە دوانزە قران. وتی: حەفتەی سێیەمیش شەش قران، ئەوە چەند؟ وتی: ئەوە هەژدە قران. وتی: ها ڕەحمەت لە باوکت مایەوە چەند؟ وتی: مایەوە قرانێك. وتی: ئا ئەوەش قرانەکە و خوات لەگەڵ! ئیتر بۆچی حەیات بردووم؟ هەر ئەڵێی پارەی خواردووم! ئەوە هەر نۆزدە قرانەکەت وەرگرت، ئیتر چیت ئەوێ؟ وەرت گرت یا وەرت نەگرت؟ ئەویش وتی: بەڵێ وەرم گرت! خوا لە برایەتی کەمت نەکا. وتی: وە دوعا و لێی دا ڕۆیشت بە تاکە تارانییەکەوە، بەڵام ئەو لای وا بوو هەر نۆزدە قرانەکەی وەرگرتووە!.

١٨٨. حاجی مەلا جەلالی سابڵاخی لە سولەیمانی ڕۆژێك لە کۆڕێکی مەلاکانا یەکێك داوای فەتوای لێ ئەکا ئەڵێ: حاجی مەلا، لەو سەر ڕێگادا مریشکێك مردار بووبووەوە، منیش نەمزانی پێم پیا نا، جووچکێك لە قنگی دەرچوو. ئایا ئەو جووجەڵەیە حەرامە یا حەڵاڵە؟

ئەویش ئەڵێ: جووجەڵەکە زیندوو بوو یان مردوو؟ ئەویش ئەڵێ: زیندوو بوو، حاجی مەلایش ئەڵێ: «برام حەڵاڵە هەر دایکەکەی حەرامە، چونکە مردار بووەتەوە»!.

١٨٩. لە هەرای شێخ مەحموودا دەستەی شێخ مەحموود بە کێوی «جاسەنە»وە بوون، تەیارە هاتبوو دابوونیە بەر بۆمبۆردمان. خەڵکەکەش لە هەموو تیرەیەکی تێدا بوو: لە جاف، لە بەرزنجی، لە بڵباس، لە خەڵکی سولەیمانی؛ تەیارەکە شپرزەی کردبوون. هەریەکە لە بنە دەوەنێکا خۆیان شاردبووەوە. دوو کابرای جاف یەکێکیان کەوتبووە سەر شاخەکە یەکێکیان لە خوارەوە بوو. ئەوەی خوارەوە بانگی ئەکرد لەوەی سەرەوە پێی ئەوت: «ئا مارف! کوچکت لێواریٚ تۆ نزیکتری وە لای خواوە بانگی لیٚ کە بەڵکوو لەم ئاگرەی قۆرەتە دەربازمان کا». ئەوی لای سەرروویش ئەیوت: «کوڕە گووت لێ واریٚ، ئەم تەیارە بیٚفەڕە لای خوای لیٚ بڕیگمەسەوە؛ نووزەم نایگاتیٚ!».

١٩٠. دوو کابرای خۆشناو بۆ تریٚ فرۆشتن ڕێگایان ئەکەوێتە ئەو دەشتی دزەییە و بەلای گوندێکا تیٚئەپەڕن، سەیر ئەکەن وا یەکێك لەسەر بانێك هەردوو دەستی خستۆتە بناگویٚ و دەنگێکی لێوە دیٚت. یەکێکیان لای وا ئەبیٚ ئەم کابرایە: «هەی تریٚ» ئەکا، زۆری پیٚ ناخۆش ئەبیٚ. ئەڵیٚ: وا تریٚ لە می گوندەی هەنە، با بچین لۆ گوندێکیکە. ئەویکەیان ئەڵیٚ: «کورە مار وێران نەبی، ئەوە هەی تریٚ نییە، ئەوە بانگی دەدریٚ».

ئەڵیٚ: بانگی چنە؟ ئەڵیٚ: «کورە چما نازانی، بانگی حەمەدی ڕیسوان».
ئەڵیٚ: چما بانگی حەمەی ڕیسوان چنە؟ ئەڵیٚ: «کورە چنە؟ یانی دە وەرنە

نوێژان دە وەرنە نوێژان».

١٩١. شێخەلی پەڕۆ هەبوو لە سولەیمانی مزگەوتێکی هەبوو لەگەڵ سەیعەلی بسمیللادا بۆرە خزمایەتییەکیان هەبوو، دڵی چەکەرەی لێ نەئەکرد کە بەلای خەڵکەوە بڵێت شێخەلی مەلا نییە؛ لە ڕاستیدا شێخەلیش وا بوو.

جارێـك بـە سـەیعەلی ئەڵێ: هەمـوو ڕۆژێ پاش عەسران وەرە لە حوجرەکـەی منـا ئەچینـەوە بـە «تەسریفی مەلاعەلی»ـدا. مەبەستی شێخەلی ئەوە بوو لای سەیعەلی بیخوێنێت و پاشان فەقێیەکی هەبوو فەقێ عەلی ناو بوو، بەوی بڵێتەوە. بەڵام دەماری نەئەهات بە سەیعەلی بڵێ: لەلات ئەخوێنم؛ ئەهات ئەم ناوەی بۆ ئەدۆزییەوە. سەیعەلیش ئەمەی ئەزانی ئەوەندە هەبوو لەبەر بۆرە خزمایەتییەکە دەنگی نەئەکرد.

بەڵێ، هەموو ڕۆژ سـەیعەلی ئەچوو لەگەڵ شێخەلیدا ئەچوونەوە بە تەسریفی مەلا عەلیدا. شێخەلیش لەبەر ئەوە کە وا لە سـەیعەلی بگەیەنێ ئەمیش لێی ئەزانێ، پرسیار و شتی لێ ئەکرد، بەڵام پرسیارەکانی هیـچ نەبـوون. شێخەلیش دانەکانـی هەمـوو کەوتبـوون، هیچـی لە دەما نەمابـوو، ڕۆژێ سـەیعەلی ئیتر لـە وزەیا نەما وتی: «بڕۆ مردووت مرێ دەمـت ئەڵێـی کونە مشـکە، تۆ عەلـی، من عەلی خاوەنـی کتێب عەلی ئەوی پێی ئەڵێیت هەر عەلی، دایکی ئەم هەموو عەلییە بگێم! دە بڕۆ ناوی خۆیشت ناوە مەلا و منیش هیچ!».

١٩٢. لـەو سـەرە پیاوێکـی ئەو دەشـتی دزەییە بـە میوانی ئەچێ بۆ خۆشـناوەتی و لـەوێ میوانـی دۆسـتێکی زۆر کۆنـی ئەبـێ؛ لە ڕاستیدا خۆشناوەتییەکانیش زۆر میوانپەروەرن. ڕۆژێك کابرای دەشتی،

لەگەڵ خۆشناوی خانەخوێدا ئەچنە دەرەوە لە گوندێ بۆ ناو ڕەزان. کابرای خۆشناو خۆی کۆ ئەکاتەوە، ڕانکوچۆغەیەکی شڕی ئەبێ لە بەری ئەکا و پەتێك ئەکا بە پشتێن، تفەنگێکی حسکەی کۆنی ئەبێ ئەیکاتە شانی، خەنجەرێکی بێفەڕە دەسکەکەی نیوەی شکابوو نیوەی مابوو، ئەیکاتە بەر پشتێنەکەیا، تەزبێحێکی دەنك گەورەش ئەپیچێنێ بە دەسکی خەنجەرە شکاوەکەدا.

بەم تەدارەکەوە ئەچنە دەرەوە و ئەچن لەسەر تاوێرێك دائەنیشن و دەست ئەکەن بە قسەی خۆش کردن. کابرای دزەیی تۆزێ سەیری خەنجەری بەر پشتێنی خۆشناوەکە ئەکا و ئەڵێ: جا ئەم خەنجەرە چییە و چی لێ دێ وا تۆ هەڵت گرتووە؟ هەر ئەم وا ئەڵێ، کابرای خۆشناوی چاوی سوور هەڵئەگەڕێ و ئەڵێ: «ما وا دەری» و بە خەنجەرەکەی پەلاماری کابرا ئەدا و دوو سێ خەنجەری بۆ دادینێتەوە بەری ناکەوێ. کابرای دزەیی پشتاوپشت ئەکێشێتەوە، بە پشتا ئەکەوێ و لە هەڵدێرەکە بەر ئەبێتەوە. ئەمجا خۆشناوەکە کە ئەزانێ وا لە وزەی خەنجەر دەرچووە، دەست ئەداتە تفەنگەکەی و دوو سێ ساچمەی تێئەگرێ. «بەرەکەت دا»، ئەویشی بەر ناکەوێ. ئیتر کابرای دزەیی هەر لەوێدا هەڵدێت و ئەگەڕێتەوە بۆ دەشتێ.

پاشان کابرای خۆشناو خۆی بە تەنیا ئەگەڕێتەوە بۆ گوندێ. پێی ئەڵێن: میوانەکەت چی لێ هات؟ ئەویش کارەساتەکەیان بۆ ئەگێڕێتەوە. ئەڵێن: ئاخر چۆن تۆ شتی وا ئەکەی؟ ئەو میوانت بوو. ئەڵێ: «ئاخۆ چما دەبیتن ئەو بە پۆزەی لەمەربابی برێ چ نینە، منیش لۆم ڕاوەشاند و پاشان سێ بیستونیویشم تێگرت. ئاوا دایەلێ دەگیم!».

(ئەو تفەنگە حسکانە حەفتا ساچمەیان ئەخوارد، پێیان ئەوت: حەفتا

خۆر؛ ئەو نەیئەزانی حەفتا چەندە ئەیوت: «سێ بیست و نیو». «ڕۆژەی لەمەربابی»ـشی مەبەستی خەنجەرەکەی بوو).

١٩٣. دەنگ وایە کە دوو مەلایەکە لەسەر شانی ڕاست و چەپی هەموو کەس هەیە؛ هی لای ڕاست چاکە ئەنووسێ و هی لای چەپ خراپە. ئەوەتە کە پیاو نوێژ ئەکا و لە ئاخری نوێژەکەیا کە لێ ئەبێتەوە لا ئەکاتەوە بەلای ڕاستەوە ئەڵێ: «السلاّم علیکم و رحمة الله و برکاته».

لالەسەرحەد نوێژی ئەکرد، کاتێ کە بەلای ڕاستا سەلامی ئەدایەوە ئەیوت: «سڵاو لەوەی فرە لە قەیتوول خۆشەویسترە». کە لای ئەکردەوە بەلای چەپا بۆ سەلام دانەوە ئەیوت: «بڕۆ فرە بێفەڕەی نەگریسە، گۆڕت گوم کە».

(ئەمە مەبەستی مەلایەکەتەکان بوو، قەیتوولیش کوڕی خۆی بوو زۆری خۆش ئەویست).

١٩٤. شێخ مارفی قەرەداغی هەبوو لەو وڵاتی خانەقینە، تۆزەتۆزە دەرزی بە فەقێیانیش ئەوت. فەقێیەکی خەڵکی «ژاوەرۆ»یش هەبوو فەقێ کەریمی ناو بوو. شێخ مارف دەرزی «إرشاد العِباد»ـی پێ ئەوت. لەبەر ئەوە کە فەقێ کەریم پرسیار و شتی لێ نەکا (چونکە لە جوابدانەوەدا کۆڵ بوو) هەر کە ئەگەیشتە شوێنێ کە هەستی ئەوەی بکردایە ئەوا فەقێ کەریم پرسیاری لێ ئەکا ئەیوت: «بەخوا فەقێ کەریم، گەرەکوڕی خۆم، ئێستە ڕەنگبێ لای خۆمان خۆش بێ؟» ئەویش ئەیوت: لای خۆمان کوێیە؟ ئەیوت: «شێتە نازانی؟» سنە و قەرەداغ ئەویش ئەیوت: بەخوا قوربان ئێستە کەما زۆرە لەوێ.

١٩٥. شێخ محەمەدی شێخ جەلال گێڕایەوە وتی: مەلا محەمەدی چرچەقەڵا وتی: ساڵێك چوومە ئەو گەرمیانە بۆ مەلایەتی ڕەمەزان. چوومە گوندی «درۆزنە»، لەوێ ئەو ڕەمەزانە بووم بە مەلای ئەوان و لە ماڵی «شێخ عیسا»ی درۆزنەدا بووم. لە دیواخانەکەی ئەوا نوێژ و تەراوێحمان ئەکرد و پاشان لەگەڵ خەڵکی ئاواییدا دائەنیشتین، وەعزێکیشم بۆ ئەدان و ئەکەوتینە قسە کردن. سەماوەریش لەولاوە دەنگی ئەهات، شەوچەرەش چی بوایە ئەیانهێنا. پاشان ژوورێکیان بۆ من دانابوو، کە بڵاوە ئەکرا من ئەچووم لەو ژوورە ئەنوستم. شەوێك لۆتییەك بە مەیموونێکەوە هاتە درۆزنە و ئەویش هەر هاتە ماڵی شێخ عیسا، خزمەتێکی باشیان کرد و پاشان ئەویش بۆ نوستن هێنایانە ژوورەکەی لای من.

هەروا دانیشتبووین قسەمان ئەکرد دووبەدوو، هێشتا خەومان لێ نەکەوتبوو وتی: «مامۆستا ناشوکری نەبێ مەسڵەحەتەکەی ئێمەش وەکوو ئەوی ئێوە باوی نەماوە. جاران من کە ئەهاتمە ئێرە چ ئیحترام و قەدرێکیان ئەگرتم، ئەوەتە ئێستە خستوومیانەتە پاڵ جەنابت و لەگەڵ تۆدا ئەمخەوێنن!».

١٩٦. حاجی شێخ عەبدوڵڵا کوڕی گەورەی شێخ بورهان بوو، چاوی تێك چووبوو، حەکیمێك دەرمانی ئەکرد. حاجی مەلا محەمەدی شەرەفکەندی لێی ئەپرسێ: چاوەکانت چۆنە؟ ئەڵێ: «قوربان بە قسەی حەکیمەکە ئەڵێ: سێ ڕۆژە چاکە!».

١٩٧. ئۆباڵی بە ئەستۆی ئەو کەسە بۆی گێڕامەوە!. ئەحەی جاو لە سولەیمانی پیاوێکی قسە نەرمی هەژار بوو، تەبەقی حەلوای

بە دەستەوە ئەگرت، ئارەزووی بکردایە حەلوایەکی ئەدا بە یەکێك بە مەجیدییەك، ئارەزوویشی بکردایە نەیئەدایە.

ئافرەتێکیش هەبوو هەر لە سولەیمانی «پوورەسەمەن»ـی ناو بوو. ڕۆژێك پوورەسەمەن سەری ڕێ بە ئەحەی جاو ئەگرێ پێی ئەڵێ: مامەحەمەد وەرە با گرەو بکەین. مامەحەمەد ئەڵێ: گرەوی چی و لەسەر چی؟ پوورەسەمەن ئەڵێ: لە سەر تەبەقە حەلوا. ئەگەر من بردمەوە تەبەقە حەلواکەت ئەبەم، ئەگەر تۆش بردتەوە بۆت پڕپڕ ئەکەم لە حەلوا. ئەڵێ: باشە دەی.

پوورەسەمەن ئەڵێ: مامەحەمەد ـ بلامانێ ـ قوز لەسەر ئەویترەوەیە یا لە ژێریەوەیە؟ ئەڵێ: بەخوا کەرە، بۆچی نازانم لە سەریەوەیەتی. پوورەسەمەن پشتی بۆ هەڵئەکا و خۆی بۆ دائەنەوێنێ ئەڵێ: ئەوە نییە لە ژێریەوەیەتی؟ مامەحەمەد سەیری ئەکا و ئەڵێ: وەڵڵا ڕاست ئەکەی، پوورەسەمەن تەبەقە حەلواکەی لێ ئەستێنێ.

مامەحەمەد ئەچێ تەبەقێکیتر پەیدا ئەکاتەوە و دوو سێ حەلوای ئەخاتە سەر و دەست ئەکاتەوە بە حەلوا فرۆشتن. لە پاش چەند ڕۆژێکیتر پوورەسەمەن سەری ڕێی پێ ئەگرێتەوە ئەڵێ: مامەحەمەد با گرەو بکەینەوە. ئەڵێ: بەخوا ئەمجارە لێت ئەبەمەوە و حەقی خۆمت لێ ئەکەمەوە. ئەڵێ: ئاخر منیش مەبەستم ئەوەیە ئەوجار دۆڕانت، ئەمجارە بەزەییم پیاتا بێتەوە بەڵکوو بیبەیتەوە. مامەحەمەد دڵی خۆش ئەبێ ئەڵێ: باشە. ئەڵێ: مامەحەمەد قوز لەسەر ئەویترەوەیە یا لە ژێریەوەیە؟ ئەڵێ: بەخوا کەرە، لای وایە ئەو جارەکەیترە لێم بەریتەوە. کەرە! لە ژێرەوەیە. پوورەسەمەن بەری بۆ هەڵئەماڵێ و ئەڵێ: ئەها سەیری بکە لە سەرەوەیە. مامەحەمەد سەیر ئەکا وایە. ئەو جارەش تەبەقە حەلواکەی لێ ئەستێنێ.

پاش ماوەیەکی‌تر دیسان سەری ڕێی پێ ئەگرێتەوە، ئەڵێ: مامەحمەد ئەمجارە بەبێ گومان ئەیبەیتەوە، وەرە با گرەو بکەینەوە. مامەحمەد تەماع ئەیگرێ و ئەڵێ: باشە، ئەڵێ: مامەحمەد قوز لەسەر قنگەوەیە یا لە ژێریەوەیە؟ مامەحمەد ئەڵێ: بڕۆ دەڵەسەگ، قوزی تۆ وەکوو چەرخوفەلەك وایە، دەمێ لە سەرەوەیە و دەمێ لە ژێرەوەیە. من گرەوی وا ناکەم!.

.١٩٨ عەبەی حەمەخەیات هەبوو لەگەڵ ڕەشەی ئەمین چاوش. بەمیان ئەوت «ڕەشەخێل». ئۆباڵی سەرتاپای قسە بە ئەستۆی حاجی سەعیدی مەلا حەسەنی عەلاف.

ئەمجا بڵێین: حاجی عەبە و حاجی ڕەشە ئەچن بۆ حەج. دوو بە دوو ئەچن لە دەوری کەعبەوە دائەنیشن و دەست ئەدەنە ژێر چەناگەیان و ڕوو ئەکەنە کەعبە. حاجی عەبە ئەڵێ: «خوایە ئەوا هاتووینەتە لات خۆت و خۆم ئەیزانین کە من تا ئێستە چ خراپە و خراپەکارییەکم کردووە، ئەوی ئێستە بە دەستمەوەیە پوولێکی حەڵاڵی تێدا نییە، هەموویم داوە بە شانما بە خۆم و ئەم ورگمەوە هاتوومەتە لات. تۆیش کەیفی خۆتە، ئەگەر پیاوەتیم لەگەڵ ئەکەی بیکە و ماڵت ئاوابێ! ئەگەر ناشیکەی جارێکی‌کە نایەمەوە. ناوێرم بیڵێم! بەڵام ماڵت کاول بێ بۆ شوێنێ کە گرتووتە. ئەوەش بزانە بە مەرقەدی کاکەحمەد بڕوا بکە ئەگەر لێم‌خۆش بیی هیچ دەنگ ناکەم!».

ئەمجا حاجی ڕەشەش کە لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو، ئەویش دەستی پێ‌کرد وتی: «خوایە بڕوا بەمە مەکە، زۆر داوبازە تۆ نایناسی من ئەیناسم، هەرچییەکی وتووە درۆ ئەکا، تەنها ئەوەی ڕاستە کە ئەڵێ: پارەکەم حەرامە،

ئەمە من شایەتی بۆ ئەدەم. بەڵام تۆ گوێت لە من بێ، من هەر خۆم ئەزانم چەندە بێناموسیم کردووە. هەر من خۆم ئەزانم ئەو پارەیە کە هێناومە بۆ ئەم حەجە بە چ دەستبڕینێك کۆم کردۆتەوە. نەکەی قەبووڵی نەکەی! بە سەری پێغەمبەر قەبووڵی نەکەی خۆم ئەزانم چی بکەم. دیسان وا پێت ئەڵێمەوە، گوێت لە قسەی ئەم کابرایەی تەنیشتمەوە نەبێت، لەگەڵ ئەوەشا ئەگەر لەبەر من لێی خۆش ببیت قەیناکا، ئەمەش هەر بۆ ئەوە، کە چووینەوە بۆ سولەیمانی بە خەڵکەکە بڵێم: خوا لەبەر من لێی خۆش بووە!».



# قسەی نەستەق

١٩٩. ساڵێك لە عێراقدا «مافەتە»یەك داكەوتبوو، عالەم هەموو تووشی چەپڵە لێدان بووبوو. لە ڕاستیدا چەپڵە لە هەموو شت زیاتر باوی هەبوو. بەتایبەتی لە وڵاتی كوردەواری عێراق، كە خەڵكەكە كۆ ئەبوونەوە و بەناو كۆڵانەكانا ئەڕۆیشتن، یەكێك سەرمەلا بوو، بە دەم چەپڵەوە ئەیوت: «با» عالەمەكەی‌تریش بۆیان ئەسەندەوە و ئەیانوت: «بژی». ئیتر چی بژی؟ ئەوە خۆیان كێیان مەبەست بووایە ئەوە بوو.

لە وڵاتی سولەیمانی مامۆستایەكی مەكتەب هەبوو تووشی ئەو دەردە بووبوو، ئەچوو بە قسەی خۆی لەگەڵ «گەل»دا «كِفاح»ی ئەكرد. هەموو كار و كاسبی و دەرس وتنەوەی بووبوو بەم خووە. ماڵ و منداڵێشی هەبوو بەجێی ئەهێشتن و ئەچوو بۆ كیفاح.

جارێك دە ڕۆژ لە ماڵەوە ون ئەبێ و ئەچێ بۆ كیفاح. پاش دە ڕۆژ چەند كەسێك لە هاوڕێكانی هەڵئەگرێ و ئەڵێ: با بچین لە ماڵی ئێمە قاوەڵتی بكەین. هەر كە دێتەوە لە دوورەوە بە ژنەكەی ئەڵێ: ئافرەت چیمان هەیە؟ ئەویش ئەڵێ: «نانی چەپڵە بە چێشتی با بژییەوە!».

٢٠٠. وتیان: قرژاڵ بە دوو سەرە ئەڕوێ؟ وتی: «جاهێڵییە و چەم و خەم».

٢٠١. باجی خەجێ هەبوو خەڵکی سولەیمانی بوو. کوڕێکی خوشکەزای هەبوو زۆری خۆش ئەویست، هەموو جار پێی ئەوت: «ئۆ ڕۆڵە ببی بە دارەکەی قەرەداغ هەزار لەقت لێ ببێتەوە!». ئەمە مەبەستی ئەوە بوو کە عومری درێژ بێ و نەتەوەی زۆری لێ بکەوێتەوە.

٢٠٢. لە زەمانی «کاکەحەمەد»دا جوولەکەیەك هەبوو لە سولەیمانی «خواجەمووشێ»ـی ناو بوو. کاکەحەمە خۆشی ئەویست، لە گەڕەکی گاورانیشا پیاوێك هەبوو «ئاڵتوونئەفەندی» ناو بوو، گاور بوو ـ نەك ئەم ئاڵتوونی دواییە ـ کاکەحەمەد ئەویشی هەر خۆش ئەویست، هاتوچۆی کاکەحەمەدیان ئەکرد و زۆر دڵیان پێوە بەند بوو.

ڕۆژێك خواجەمووشێ و ئاڵتوونئەفەندی لەلای کاکەحەمەد ئەبێ بە دەمقڕەیان لەسەر عیسا و مووسا. خواجەمووشێ ئەڵێ: مووسا گەورەترە، ئاڵتوونئەفەندی ئەڵێ: عیسا گەورەترە. لە ئەنجاما ئاڵتوونئەفەندی ئەڵێ: «خواجەمووشێ، ئەمەی پێ ناوێ، حەزرەتی عیسا مردووی زیندوو ئەکردەوە، کەچی مووسا بە دار ئەیدا لە کابرایەك و ئەیکوشت. حەزرەتی عیسا هەر لە بێشکەدا قسەی ئەکرد؛ کەچی مووسا لە تەمەنی چل ساڵیدا ئەیوت خوایە زمانم بکەرەوە و قسەم جێی خۆی بگرێ. ئەگەر بڕواشم پێ ناکەی ئەوە حاجی کاکەحەمە تەماشای قورعانی حەزرەتی محەمەد بکا بزانێ ئەمەی من ئەیڵێم هەیە لەوێدا یا نە؟» بەمە بۆڕی خواجەمووشێی دا و جووکەی لێ بڕی!.

٢٠٣. کابرایەك هەبوو خەڵکی ئەو سیوەیلە بوو. لەگەڵ فەقێ و مەلادا زۆر دانیشتبوو، گەلێ جار گوێی لێ ئەبوو کە مەلاکان

ئەیانوت: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾. ئەمیش هەر قسەیەك ئەهاتە پێشەوە خێرا ئەیوت: «ئینِنا لیللا».

ڕۆژێـك لێیان پرسی: خاڵە بۆ مەعنای ئەوە ئەزانی وا هەموو جار ئەیڵێی؟ وتی: «وەڵڵا بە تەواوی نایزانم، بەڵام ئەزانم بۆ زیافەت و زەماوەن و ئاهەنگ و بەزم نییە!».

٢٠٤. «خلە»ی مەحمووی پیروەیس، خوشکێکی هەبوو دابووی بە مێرد. پاش ماوەیەك مێردی خوشکەکەی مردبوو. لە خلە ئەپرسن: مامەخلە پیزەی خوشکت میراتی چی بەرکەوت لە مێردەکەی؟ وتی: «چوار مانگ و دە ڕۆژ!».

٢٠٥. هەر لەم خلەی پیروەیسە ئەپرسن: مامەخلە ئەبێ یەکێ عومری نەوەد ساڵ بێ و مناڵی ببێ؟ ئەڵێ: «بەڵێ، ئەگەر دراوسێی بیست ساڵانی هەبێ!».

٢٠٦. «ئەحەی کرنوو» جارێـك ئەچێتە کۆیە سەیر ئەکا پیاوێك دوو مناڵی جوانی لەگەڵایە. بە پیاوەکە ئەڵێ: ئەرێ برا توخوا تۆ ناوت چییە؟ ئەڵێ: «عبدالواحد». ئەڵێ: «دە لاچۆ تۆ بەجێیان بێڵە، من عەبدی هەردووکیانم!».

٢٠٧. هەر ئەم ئەحەیکرنووە ژنە پێشووەکەی ئەمرێ و ژنێکی تر دێنێ. لێی ئەپرسن: مامە حەمەد چۆنە ئەمەیان؟ ئەڵێ: «دەنگ مەکەن دوو چاکە لە چاکەکانی بەهەشتی تێدایە: یەکێ فێنکی و یەکێ فراوانی!».

٢٠٨. مەلا سەعیدێکی «ابن عباسی» هەبوو ئەیانوت: سەروسەودای لەگەڵ هەتیو و مەتیودا زۆر بووە. ڕۆژێك لێی ئەپرسن: مەلا سەعید زۆر سەیرە، ئەوانەی دزی ئەکەن، ئەوانەی بەنەوخوێن پیسی ئەکەن، کۆششی ئەوە ئەکەن کە بە دزی بیکەن و ئیشەکەیان دەرنەکەوێ، تۆ بۆچ وا بەم جۆرە ناوبانگت دەرکردووە و حەیات چووە؟ ئەویش ئەڵێ: «یەکێ ئیشی بکەوێتە بەر دەستی منالان چۆن حەیای ناچێ؟!».

٢٠٩. «فایەق بێکەس» جارێك ئەچن بە سەریا سەیر ئەکەن عەرەق ئەخواتەوە، بەڵام لەباتی مەزەکەی مێوژ و ترێی داناوە. قومێك لە عەرەقەکە ئەخواتەوە، دەنکێ مێوژ و بۆڵە ترێیەك ئەخوا بە سەریا. ئەڵێن: فایەقە کوێر ئەمە چییە؟ ئەڵێ: «ئیشی ئێوە نییە ئەمە کوڕ و باوك و "روح القُدسە"!».

٢١٠. «مامەیارە» هەبوو، پیر بووبوو. لێیان ئەپرسی: مامەیارە لە شتومەکی شەوی زاوایی چیت ماوە؟ ئەیوت: «بەخوا براینە، تەنها تفەکەم ماوە!».

٢١١. پاشا کۆرەی ڕەواندز جوولەکەیەکی لا هەبوو «حاتان»ـی ناو بوو؛ خۆشی ئەویست. مەیتەرێکیشی لا هەبوو «وسە»ی ناو بوو، بەڵام هەتا حەز بکەی وسە ناشیرین بوو. خۆت ئەزانی ئەو سەردەمە جوولەکە لە ڕەواندز هیچ قەدر و قیمەتێکیان نەبوو، هەرکەس هەڵئەستا قسەی پێ ئەوتن، لەبەر ئەمە وسەش بە تەواوی بە قسە پێ وتن فێری حاتان بووبوو.

ڕۆژێك وسە بە حاتان ئەڵێ: «کافر، تۆ خۆت و هەموو جوولەکەکان کافرن». حاتانیش ئەڵێ: «بەخوا وسە نە من کافرم، نە جوولەکەکان کافرن.

کافر ئەو کەسەیە کە لای وایە خوا تۆی وە جوانی دروست کردووە!».

٢١٢. کابرایەك هەبوو لە «سەقز» زۆر ناشیرین بوو؛ ناشیرینەکەی لەو ناوەدا دەنگی دابووەوە. ئەم کابرایە مەلاش بوو، بەڵام کاسبی ئەکرد. کوڕێکی هەبوو فەقێ عەوڵای ناو بوو، لە فەقێتی هاتبووەوە بۆ سەردان. هەرچەن ئەچووەماڵەوە سەیری ئەکرد باوکی لەناو ئاوێنەدا سەیری خۆی ئەکا و لێویشی ئەبزوێ و ئەم نەیئەزانی چی ئەڵێ: کوتوپڕ جارێك چووە ژوورەوە سەیری کرد باوکی دیسان سەیری خۆی ئەکا لە ئاوێنەدا و ئەڵێ: «**الحَمدُ لِلّه الّذی صَوَّرَنِي فَأَحْسَنَ صُورَتِي**». هاتە دەرەوە یەکێك لەبەر دەرگای حەوشەدا بوو وتی: باوکت لە ماڵە؟ وتی: بەڵێ. وتی: چی ئەکا؟ وتی: «چی ئەکا؟ خەریکە خوا ئەخاتە درۆوە!».

٢١٣. لە سنە، لە سەرقەبرانی «شێخان» چەند گۆڕێکی درێژ هەبوون، هەر زۆر زۆر درێژ بوون. ئاغە حەمەحەسەن هەبوو ڕۆژێك لەگەڵ هەندێ کەسا بەوێدا تێئەپەڕێ، سەیری ئەو قەبرە درێژانە ئەکا. بەلایەوە زۆر سەیر ئەبن! ئەپرسێ: ئەمانە چین؟ ئەڵێن: ئەمانە قەبری ئەسحابەن. تۆزێکی‌تر تێیان ئەفکرێ و ئەڵێ: «ها، ها بەڵێ، ئەمانە ئەبێ ئەسحابەگەل بن ئەو ئەسحابەگەلە کە بەیداخەکانیانەوە لێرە نریاگن!».

٢١٤. مەلا تۆفیق هەبوو لە سولەیمانی دەستی حەکیمی هەبوو؛ داودەرمانی ئەفرۆشت. حاجی کەریمی شمقارِیش هەبوو پیاوێکی زۆر پیر بوو. ڕۆژێك ئەچێتە لای مەلا تۆفیق ئەڵێ: سێ ژنم هەیە بە دایمی کەلەکەم و بەرمووسڵدانم و ناو سکم ژان ئەکا. دەرمانێکم پێ ناڵێی بیخۆم و چاك ببمەوە؟ مەلا تۆفیقیش ئەڵێ: «مەعجوونی تۆ

تەڵاقە، بخۆ چاك ئەبێتەوە!».

٢١٥. لە هەولێر کابرایەك لە مامۆستا مەلا ساڵحی کۆزەپانکە ئەپرسێ: مامۆستا بۆچی لە زەمانی پێشوا هەرکە هەڵئەستا یا داوای خوایی ئەکرد یا داوای پێغەمبەری ئەکرد؟ کەچی ئێستە کەسێك نییە داوای ئەوانە بکات؟ ئەویش ئەڵێ: «ڕۆڵە ئێستە ئەوەندە زوڵم و ستەم زۆر بووە خەڵك نە خوای بە دڵا دێت و نە پێغەمبەر!».

٢١٦. کابرایەك بە دراوسێیەکی خۆی وت: فلآنی، چوار ڕبە گەنمم هەبوو، تا خەبەرم بووەوە مشك هەمووی خوارد! ئەمیش وتی: «فلآنی منیش چوار ڕبە گەنمم هەبوو، تا مشك خەبەری بووەوە من هەمووم خوارد!».

٢١٧. میرزا ئیسماعیلی «نصرت‌نظام» ئاغایەکی بە دیمەن و پیاوێکی ناودار بوو لە دێ «مامێزەك». (مامێزەك: گوندێکە لە بەینی کرماشان و سنەدا نزیك بە «سونگر»)

ئەم نوسرەت‌نیزامە پیاوێکی هەبوو «هاشم»ـی ناو بوو. سەرەتا هیچ لووتی پیا نەئەهێنا و زۆر لەگەڵی خراپ بوو. ڕۆژێك هاشم پێی ئەڵێ: ئاغەی نوسرەت‌نیزام تۆ نازانی ئەم هەموو خراپەیە کە لەگەڵ منی ئەکەی لەگەڵ خۆتی ئەکەی؟ ئەڵێ: چۆن؟ ئەڵێ: «وەختی خۆی حاجی میرزا مەجیدی باوکت خوازبێنی دایکی منی کردبوو، ئەگەر ئەو خوازبێنییە ڕێ بکەوتایە و ببوونایە بە هاوسەر، ئێستە من تۆ ئەبووم».

نوسرەت‌نیزام قسەکەی بە لاوە سەیر ئەبێ، ئیتر لەو وەختە بە دواوە کردی بە پیاوماقووڵی خۆی.

٢١٨. کوێخا یووسفی تاوەگۆزی لە «پشتە» لەلای شێخ «نجم‌الدین»ی بیارە ئەبێ. ئەم کوێخا یووسفە پیاوێکی پیاوانە و کوڕدار و دەست ڕۆیشتوو بوو، وە خۆیان لە بەرەی مەلا ئەبوبەکری «مُصنّف» ئەزانی.

«مخە» ناوێکیش هەبوو ڕووتەڵە و بێ‌فەڕ بوو. ئەچێتە لای شێخ نەجمەددین پێی ئەڵێ: یا شێخ منیش تاوەگۆزیم و لە بەرەی مەلا ئەبوبەکری موسەننیفم. تۆیش شایەتی ئەوەم بۆ بدە کە منیش وەکوو ئەوان سەیدم. کوێخا یووسف لەم قسەیە تووڕە ئەبێ و ئەڵێ: «ئەرێ مخە پیس، ئەوە تۆ ئێژی چی؟ سەید ئەوێ ناوچەوانی نوورانی وێ، ناوقەدی باریک وێ، دەست و پەنجەی توێ قەڵەمی وێ، تۆ لە کوێ ئەوی وە سەید؟ سەر و شکڵت ئێژی مەیموونە، قنگت ئەوەندە فراوانە باوەشێ بەڵمی پیا ئەچێ، ئاخر تۆ کەی ئەوی وە سەید؟!»

٢١٩. پیاوێکی بەرزانی هەبوو «محەمەدئەمین بیجان»ی ناو بوو، تەمەنی تەنگی لە حەفتا ساڵێك هەڵچنیبوو. ماوەیەك بوو لە کۆڕی شەڕوشۆڕا بوو. ڕۆژێك بیستی وا ئاگری شەڕێك کراوەتەوە بۆ ئەوە دیسان بەرزان تێ‌هەڵچێتەوە. کە ئەمەی بیست لوولەی تفەنگەکەی گرت، هەڵی‌سووڕان و وتی: «پیاو ئەوەیە بکۆڕێنێ و بلووڕێنێ بۆ شەڕ، نە وەکوو ژنان لە گوێ‌ئاگردانا دانیشێ!».

٢٢٠. کابرایەکی «یوسۆجانی» کوڕێکی هەبوو مردبوو. خەڵکوخوا دڵیان ئەدایەوە و ئەیانوت: خوا بەڕەحمە، ئیشەڵڵا جەزای سەبرەکەت ئەداتەوە. ئەویش ئەیوت: «توخوا براگەل واز بێرن، خوا هیچ کوڕ و کچێکی نەبووە بمرێت، هەر خاسە هاریش ناوێ!».

٢٢١. جارێـك مەحمووپاشا ئەڵێ: پیاوێکی ژیرم ئەوێ بینێرم بۆ شار بۆلای حوکوومەت. فەقێ‌شێتە لەوێ ئەبێ ئەڵێ: «پاشا، هەرکەس ئەقڵی بوو، لەم دیواخانە دەرچوو!».

٢٢٢. مەلا «فَیض‌الله» هەبوو لە سنە شاعیر بوو. ڕۆژێك «نظام‌الإسلام» پێی ئەڵێ: «کێ لە گشت کەس بەلای تۆوە خۆشەویستترە؟» ئەڵێ: «ئاغەی نیزام، ئەو کەسە کە سکم تێر بکا». ئەڵێ: من تێری ئەکەم. ئەڵێ: «ئاغە نیزام، خۆشەویستی بە قەرز ناوێ!».

٢٢٣. پیاوێکم لابوو «مام‌پیرداود»مان پێ ئەوت. ڕۆژێك هەندێ ژێرجگەرە و ئیستکان و شتە هەبوو، وتم: بیانشۆ. پاشان خۆم هەڵم‌گرتن کە بۆی بەرم بۆ سەر ئاوەکە. ئەو نەیهێشت. وتم: «کوڕە ئەیبەم ئەگەر نەشکێن، قەیناکا؟». وتی: کوڕە ئەگەر بشکێنیش هەر قەیناکا، چونکە کاسەیە کابان بیشکێنێ دەنگی نایە!».

٢٢٤. کابرایەکی هەژار لەو کوێستانە لە بەر کێوێکی گەورەدا ڕائەوەستێ و زۆر بە تامەزرۆییەوە ئەڵێ: خوایە ئەم کێوەم بۆ بکە بە زێڕ. سەیر ئەکا کێوەکە بوو بە زێڕ. واقی وڕ ئەمێنێ! کە ئەمەی چۆن بۆ هەڵگیرێ. ئەڵێ: «خوایە هەرکە داوای کەمت لێ ئەکا کوێر بێ». سەیر ئەکا هەردوو چاوی کوێر بوو!.

٢٢٥. شێخ «مُحی‌الدین»ی خەتیب هەبوو لە سولەیمانی، کە یەکێك لە ئیشێکا سەرنەکەوتایە ئەیوت: «فەشەلە فیعلی مازییە، قەت کولانەکەی خۆی ون ناکا!».

٢٢٦. کابرایەك هەبوو لەو وڵاتی پێنجوێنە «مۆلەشێت»ـیان پێ ئەوت. مەلا ئەوڕەحمانی پێنجوێنێ هەر فەقێیەکی ئاخرمادە خوێـن، ئەچـووە لای بـۆ دەرس خوێنـدن، مۆلەش ئەچووە بن دەستی فەقێکەوە و سەماعی ئەکرد. فەقێیەك ڕۆژێ ئەچێ کتێبی «جمع الجوامع» ئەبا و دەرس ئەخوێنـێ، مۆلـەش «ناگەهان»ـێك ئـەبا و لـە تەنیشت فەقێکەوە پانی ئەکاتەوە و دەست ئەکا بە سەماعکردن. مەلا ئەوڕەحمان پـێ ئەڵێ: مۆلـە! جەمعولجەوامیـع و ناگەهـان چـۆن ڕێ ئەکـەون؟ ئەویش ئەڵێ: «قوربان بۆ یەکێ شیری پاك بێ هیچ فەرقی نییە!».

٢٢٧. کتێبی «"عبدالحکیم" و خەیاڵی» لەناو فەقێیانا مەشهوورە، کە ڕەق و گرانە. هەر ئەو مۆلەشێتە ڕۆژێك ئەچێت ئەو کتێبە لە یەکـێ لـە فەقیەکان ئەدزێ و ئەیخاتە ناو توورەکەیەکەوە و ئەیخاتە بنی حەوزی مزگەوتەکەوە. لە پاش سـێ چوار ڕۆژ ئەچێ دەری ئەهێنێتەوە. (دیارە کتێب تلیساوەتەوە و وەکوو هەویری لێ هاتووە). جا ئەیوت: ئەوا ئەم فەقێیانە هەر ئەڵێن: عەبدولحکەیم و خەیاڵی ڕەقە، کوا ڕەقە؟ چاوتان لێیە چۆن تلیساوەتەوە؟ ئەوە ئەوان نایزانن!.

٢٢٨. ساڵی غەزاغەزاکە شێخ «نجم‌الدین» و شێخی «حسام‌الدین» چووبوون بۆ غەزای ڕووس و گەڕابوونەوە. کوڕوکاڵی هەورامی چووبوون بۆ پێشوازیان. مەلا حسێنی کوڕی مەلا قادری بیارەش لەگەڵ ئەو پێشـوازیکەرانەدا بوو. کوڕوکاڵ هەریـەکە سـواری شتێك بووبوون؛ مەلا حسێن بە پێیان بوو. شێخی حیسامەددین پێی ئەڵێ: «مەلا حسێن ئـەوە کەرێـك نەبوو سـواری ببی؟» ئەویـش ئەڵێ: «قـوربان کەر زۆرە، بەڵام بەر من ناکەوێ!».

٢٢٩. مەولەوی چاوەکانی کوێر بووبوون؛ لە پاش ماوەیەك مەلا مووسایەکی پاوەیی هەبوو، ئەچێ بۆلای و دەست ئەکا بە دڵدانەوەی مەولەوی و ئەڵێ: «هیچ پێی سەغڵەت مەبە، ئەگەر بزانی سەواب و جەزای بێچاوی چەندە زۆرە، خۆزگات ئەخواست بۆ ئەوە کە خوا هەردوو دەست و قاچیشت کوچ بکا و تووشی ملەخرەش ببی».

مەولەویش ئەڵێ: «مەلا مووسا ئەگەر بە هیچا نەزانم جەزای چاو نەبوون چەند زۆرە، بەوەدا ئەیزانم: کە تۆی پێ نابینم!».

٢٣٠. حاجی برایمئاغای عەمبار- خوا بێقەزای کا- پیاوێك بوو ئەوەندە سەری لە ئیش و کاری دنیا دەرنەئەچوو. بە پێچەوانەی خۆی، کوڕێکی منداڵی هەبوو زۆری خۆش ئەویست. ڕۆژێ لێی ئەپرسێ: کوڕی بابی، حەزت ئەکرد سەد هەزار تمەنت بیوایە و وەکوو بابت ئاقڵ بوویتایە؟ ئەڵێ: نەوەڵڵا بابە. ئەڵێ: بۆچی کوڕم؟ ئەڵێ: «ئەترسم ئەو ئەقڵەی بابم کە بە منەوە بێ، ئیشێکی وام پێ بکا سەد هەزار تمەنەکەم لە دەست دەرکا و هەر ئەقڵەکە خۆی بمێنێتەوە؛ منیش ئەوەم ناوێ». باوکیشی ئەڵێ: «ئافەرەم کوڕی خۆم دیارە تۆ لە هەموو کەس زیاتر بابی خۆت بە ئاقڵتر ئەزانی! ئەی لە بابت کەوێ بێچووە کەوێ».

٢٣١. ژن و پیاوێك هەبوون لە «ڕەواندز» هیچیان چاویان نەبوو، لە ئەنجاما بوون بە هاوسەری یەك. ژنەکە بە پیاوەکەی وت: «کووم دەبینی؟» پیاوەکەش وتی: «تۆ کوو من دەبینی منیش وا تۆ دەبینم!».

٢٣٢. ئەمین چیتر هەبوو لە سولەیمانی زۆرتر موعامەلەی مەڕ و بزنی لەگەڵ شارەزوور بوو. کە شارەزوورییەکان ئەهاتن و ئەچوونە ماڵی، بە نان و ماستاو و شتێکی وا بەڕێی ئەکردن و ئەیوت:

«لـە گـۆڕی بابـی بێبرنجی بم؛ ئەگەر ڕۆنمان ئەبوو قبوولّیەکی باشم بۆ لێئەنان». ئەوانیش ئەم قسەیانە بە خەلاّت ئەزانی و ئەیانوت: نەوەڵڵا کاکەمین زەحمەت مەکێشە، خوا نەیوڕێ ئەم نان و ماستاوە فرە خاسە!.

٢٣٣. جارێك کابرایەکی بەڵخەیی لەگەڵ کابرایەکی عەبابەیلی لە بەڵخەوە دێن بۆ عەبابەیلێ. بەڵخە هەنجیری زۆر چاکی هەیە. بەڵخەییەکە هەر لە ماڵەوە پڕ گیرفانی ئەکا لە هەنجیر و بەڕێ ئەکەون. کابـرای عەبابەیلـی لە پێشـەوە ئـەڕوا، بەڵخەییەکەش لـە دوایەوە ئەبێ، ئەمیش ئەزانـێ ئـەو هەنجیـری پێیە، بـەلاّم دەنـگ ناکا، بەڵخەییەکە جارجار لە هەلێکا هەنجیرێك لە گیرفانی دەردێنێ و ئەیتەپێنێتە دەمی. ئەمیش لەبەر ئەوە کە ئەزانێ ئەو هەنجیری پێیە و بە دزی ئەمەوە ئەیخوا و واش ئەزانێ کە ئەم پێی نازانێ، جارجار لایەکی بۆ ئەکاتەوە، ئەویـش بۆ ئەوە ئەم پێی نەزانێ بای ئەدا و لوولی ئەدا و قووتی ئەدا و ملی گەزێ درێژ ئەبێتەوە!.

لە ئەنجاما پێی ئەڵێ: «ئەرێ برا ئەم گەرووی تۆ بوو بە چی؟ هەمانە بێ هەر ئەدڕێ، مەشکە بێ هەر ئەدڕێ، ئەگەر دوو دەنك لە هەنجیرەکەت بدەی بە من و ئەوی‌تری بەبێ ترس و لەرز بە هەموو سەربەستییەکەوە خۆت بیخۆی باشتر نییە؟» کابرا ئەمجا ئەزانێ کە پێی زانیوە، ناچار ئەبێ بەشی ئەدا!.

٢٣٤. جـارێ کابرایەکـی ئەو سـەرە لە کابرایەکی پشـدەری ئەپرسـێ: چۆنی؟ ئەویـش ئەڵێ: «بە کەیفی دوژمنانم!».

٢٣٥. ئینگلیز پاش شەڕی گەورەی یەکەم هاتە عێراق و کوردستانەوە. لە وڵاتی سولەیمانی شێخ مەحموو گیرا، بە دیل برا بۆ «هندستان»

و پاشان هێنایانەوە.

حاجی مەلا سەعید کەرکووکیزادە هەبوو لە سولەیمانی یەکێك بوو لە پیاوەگەورەکانی سولەیمانی و قسەی ئەبیسترا. لەگەڵ شێخ مەحموویش بەینی ڕێك نەبوو. کە بیستی وا شێخ مەحموو دێتەوە بۆ سولەیمانی و بە حوکمڕانیش دێتەوە، بە کوڕەکانی ئەڵێ: ماڵ بار کەن و سولەیمانی چۆڵ کەن، هیچ لێ ڕامەوەستن. ئەڵێن: بۆچی؟ ئەڵێ: «ئەڵێن: ئینگلیز سەربەخۆیی ئەدا بە کورد». ئەڵێن: بابە شتی وا چۆن ئەبێ؟ ئەڵێ: «کوڕم، ئینگلیز کافرە، دای دای؛ کێ هەیە ڕێگای لێ بگرێ، دە خێراکەن ماڵ بار کەن تا نەیداوە!».

٢٣٦. مەلا حسێنی قادری بیارە جگەرەی تەرك کردبوو. پێیان وت: مامۆستا ئەوە جگەرەت تەرك کردووە؟ وتی: «ئەرێ، نەژیم!».

٢٣٧. ساڵێك لە سولەیمانی کابرایەکی جێشانەیی کەرێکی پێ ئەبێ. لەو «کانیدۆمان»ـە لەلای مزگەوتی مەلا مەحموودی نیزامی کەرەکەی لەبەر ماڵێکا ئەبەستێتەوە و خۆی ئەچێ بۆ دووکانێ کە لەو دەورەدا هەبوو، شت بکڕێ. مناڵێکی ئەو گەڕەکە دێنێ کەرەکە ئەکاتەوە و سواری ئەبێ و چەند ئەمسەر و ئەوسەرێکی پێ ئەکا. لەو کاتەدا کابرای خاوەن کەر ئەگەڕێتەوە لە مناڵەکە تووڕە ئەبێ: کە بۆچی وای کردووە. مناڵەکەش ئەڵێ: گوێدرێژەکەت بەڕەڵا بووبوو، من ئاگاداریم کرد بۆت تا هاتیتەوە. کابراش ئەڵێ: ئەگەر ون بیوایە باشتر بوو لەلام، لەوەکەوا تۆ بەم دەردەت برد و ئەوەندە سواری بوویت!. مناڵەکەش ئەڵێ: «ئەگەر تۆ بیروباوەڕت وایە، کەواتە بێنە کەرەکە بدە بە من و وا بزانە ون بووە و لە تۆڵەی ئەوەدا گەلێ دوعاش قازانج ئەکەی کە من بۆت ئەکەم!».

٢٣٨. کابرایەکی بیاوێڵەیی ئەچێتە هەڵەبجە، گوێدرێژیکی پێ ئەبێ. شەوێ ئەمێنێتەوە. لە بەیانییا هاواری لێ بەرز ئەبێتەوە کە کەرەکەیان دزیوم. یەکێك پێ ئەڵێ: بابە تۆ خەتای خۆت بوو کە ئاگاداریت نەکردووە. یەکێکی‌تر ئەڵێ: کوڕە خەتایەکی گەورەتر: دەرگای تەوێڵەکەشی دانەخستووە. کابرا ئەڵێ: «کەواتە دزەکە هیچ خەتایەکی نییە!».

٢٣٩. ئەعیانەکانی سنە هەموو حەوشەکانیان دەروازەی گەورە گەورەی هەبوو. لەملاولەولای دەروازەکانەوە سەکۆ هەبوو پێیان ئەوت: خواجەنشین. دەروێش و قەلەندەری تەریدە ئەهاتن ئەم خواجەنشینانەیان ئەکرد بە جێگای حەسانەوەی شەو و ڕۆژیان.

لەسەر ئەم دەستووره قەلەندەرێك لەسەر خواجەنشینی دەروازەی ماڵی موشیردیوانی گەورە بوو. ئەم قەلەندەرە بە زستان و هاوین کراسێکی تەنکی لەبەرا بوو. ڕۆژێك لە تۆفی زستانا موشیردیوان دێتە دەرەوە و دەروێشەکەی بەو کراسە تەنکەوە چاوپێ‌ئەکەوێ، ئەڵێ: ئاغە بەم کراسە ناسکەوە لەبەر ئەم سەرما سەختەدا چۆن سەرمات ناوێ؟ من بەم گشتە جلەوە هەر ئەلەرزم؟ ئەویش ئەڵێ: «ئاغەی موشیر تۆیچ وەکوو من بکە تا نەلەرزی!». ئەڵێ: ئاغە بۆچە تۆ چەت کردگە؟ ئەڵێ: «من هەرچی جلم بووگە گشتم لەبەر کردگە!».

٢٤٠. پیاوێك هەبوو لە سنە حاجی دەروێشی ناو بوو، زەمان پشتی تێ هەڵکرد و هەژار کەوت؛ بەڵام چۆن هەژارێك؟ شێوی شەوی نەما. کوڕێکی هەبوو «تەقی» ناو بوو منداڵ بوو. ڕۆژێك لەسەر کۆڵانێکا هەردووکیان ڕاوەستابوون، خەڵك تەرمێکیان بەوێدا تێ‌پەڕاند.

تەقی وتی: بابە ئەمە چییە؟ وتی: ڕۆڵە مردووە. وتی: بۆ کوێی ئەبەن؟ وتی: ڕۆڵە ئەیبەن بۆ شوێنێك نە نانی لێیە و نە ئاو، نە بەرگی لێیە و نە نوێن، نە داری لێیە و نە ئاگر، نە بەڕەی لێیە و نە قاڵی، نە تەلای لێیە و نە نوقرە. وتی: کەواتە بابە ئەمە بۆ ماڵ ئێمەی ئەبەن!».

٢٤١. مەلا مەحمووی حاجی ڕەسووڵ گێڕایەوە وتی: «حسەکەڕ»ە هەبوو لە زەمانی سەی ئەحمەدی بابەڕەسوولا لە سولەیمانی. ئەم حسەکەڕە چایچی و لە هەموو ڕووەیەکەوە پیاوێکی پیاوانە و بە دیمەن و دەوڵەمەند بوو. ئەو سەردەمە «شەڕەبەران» باوی هەبوو، زیاتر شێخانی سولەیمانی حەزیان لێ ئەکرد. حسەش بەرانی چاکی هەبوو.

سەی ئەحمەدی بابەڕەسووڵ ئەنێرێ بەشوێن حسەکەڕدا کە بەرانەکەی بێنێ لە حەوشەکەی ئێمەدا بەرانێکی تریش لێرە هەیە شەڕەبەرانی پێ بکەن، با تۆزێ سەیریان بکەین. حسەش نەیئەتوانی لە قسەی سەی ئەحمەد دەرچێ. پاش عەسرێك بوو، بەرانێکی نایابی هەبوو ملی گرت و چوو بۆ ماڵی سەی ئەحمەد.

سەی ئەحمەدی برای سەی نووری نەقیبیش دراوسێی ماڵی سەی ئەحمەدی بابەڕەسووڵ بوو، دیوارێکیان بەین بوو. ئەو سەی ئەحمەدە هەر جارە شەڕەقۆچی ماڵی ئەو سەی ئەحمەدی ئەبینی، بەینیشیان زۆر خۆش نەبوو. کە حسە بە خۆی و بەرانەکەیەوە ئەگاتە بەر ماڵی سەی ئەحمەدی نەقیب، سەی ئەحمەد لەبەر دەروازەکەدا ئەبێ، بەبێ قسە بەردێك هەڵئەگرێ و ئەیدا لەسەر حسەکەڕ سەری ئەشکێنێ. حسە دەست ئەگرێ بە سەریەوە. سەی ئەحمەد ئەڵێ: بۆچی ئەوە ژانی کرد؟ حسە ئەڵێ: قوربان چۆن نەیکرد؟ سەی ئەحمەد ئەڵێ: کەواتە

ئەم بەرانەش ڕۆحی هەیە، چۆن شەڕەقۆچی پێ ئەکەن؟ ئاخر نازانی سەری ئەویش ئاوا ژان ئەکا؟ حسەکەڕیش ئەڵێ: «کەواتە قوربان یا خوا ئێوە لە ئێمە بستێنێ، یا ئێمە لە ئێوە بستێنێ!. ئەو سەی ئەحمەدە بە زۆر ڕام ئەکێشێ ئەڵێ: وەرە شەڕەقۆچ بکە، ئەم سەی ئەحمەدە ئەڵێ: مەیکە، ئێمەش نازانین بەگوێی کام لاتان بکەین؟!».

٢٤٢. هەر مەلا مەحموو گێڕایەوە وتی: چووم بۆ خزمەتی شێخ مەحموو، ماینێکی ڕەشبۆری چاکم هەبوو سواری بووبووم. ماینەکە جاش ئێسترێکی هەبوو، لەبەر جوانی و لەبەر چەتوونی، لە ماڵا وتم: گلی بدەنەوە و مەیەڵن بکەوێتە شوێن ماینەکە. من بەڕێ کەوتم، ئەوانیش جاش ئێستریان گل دایەوە. بەڵام جاش ئێستر بەبێ دایکەکەی ئۆقرەی نەگرت، لەسەر دیوارەکەوە بازی دابووە کۆڵان. ئەوەندەم زانی بە چوار ناڵە وەکوو با ئەهات، تا گەیشت بە دایکەکەی. ئیتر تازە کەڵکی گێڕانەوەی بڕا.

وتی: کە چووم، شێخ دوو ڕۆژ گلی دامەوە. وتی: ئەوەندە من ئیخلاس و بچووکی شێخم هەبوو، ئەویش ئەوەندە لوتفی لەگەڵ من هەبوو. لەسەر سێ ڕۆژیا عەرزم کرد: قوربان، ئیتر ئەچمەوە، ئەویش ئیزنی دام. سوار بووم، هات بەڕێی کردم. عەرزم کرد: قوربان من ڕایەی ئەوەم نییە، فەرمووی: خۆت شێت مەکە، تۆ کوڕی حاجی مەلا ڕەسووڵیت. حاجی مەلا ڕەسووڵ خەلیفەی کاکەحمەد بووە.

وتی: من وا بەسەر ماینەکەوەم و شێخیش ڕاوەستاوە. جاش ئێسترەکە بە دەوروبەری ماینەکەدا دێت و ئەچێ. شێخ دەستێکی دا لە کەفەڵی و فەرمووی: مەلا مەحموو ئەمە جاش ئێستری چاکە. عەرزم کرد: بەڵێ

قوربان. دەستێکی تری هێنایەوە بە کەفەڵیا و فەرمووی: بەڕاستی جاش ئێسترێکی زۆر چاکە. من هەر عەرزم کرد: بەڵێ قوربان. ئنجا فەرمووی: «مەلا مەحموو ئەمە لە خۆتە؟» منیش عەرزم کرد: «قوربان شێخ‌زادەیە!». دەستی کرد بە پێکەنین فەرمووی: بەخوا بێ‌حەیایت. ئنجا ئیتر فەرمووی دە بڕۆ خواحافیزت بێ.

٢٤٣. لە سنە پیاوێك هەبوو مەلاکان پێی فێر بووبوون؛ بە ناوی خێر و خێراتەوە هەر ڕۆژێ شتێکیان پێ ئەکرد. هەرچەند خەڵك پێیان ئەوت: بۆچ وا ئەکەی؟ ئەیوت: ئەمانە هەموو بۆ خوایە. کە زۆریان بە گوێچکەیا ئەخوێند، تۆزێ سست ئەبووەوە. کوتوپڕ دوو مەلای لێ پەیدا ئەبوو، دیسان تیژیان ئەکردەوە. ئەمە حاڵی بوو تا ما، ئنجا مرد، خەڵکێکی زۆر و مەلایەکی زۆری لێ کۆ بووەوە بردیان بۆ سەر قەبران. مەلاکان هەموو کەوتبوونە پێش تەرمەکەی و هەموو بە ماتەمییەوە ڕێگایان ئەکرد. بەڵام هێشتا ئیسقاتەکەی مابوو بیکەن، کە لەسەر قەبران بگەڕانایەوە ئیسقاتەکەشیان بۆ ئەکرد.

لەو کاتەدا کە ئەچوون بۆ سەرقەبران دوو قۆڵچماخی سنەیی لە دوورەوە چاویان بەم دیمەنە و بەم مەلایانە ئەکەوێ. یەکێکیان دەستێك ئەژەنێ بەوی‌کەیانەوە ئاگاداری ئەکاتەوە و پێی ئەڵێ: «شا شا، بە مردگیش لە کۆڵی ناونەوە!».

٢٤٤. دێیەك هەیە لەو وڵاتی سنە «کانی‌مشکان»ی ناوە. پیاوێکیش هەیە «قوسەیری» پێ ئەڵێن و زاوای «آیة‌الله»یە. ئایەتوڵڵا پشیلەیەکی کەللەزلی تووکنی زۆر سەیری هەیە و لە بەردەمیا هەڵئەتووتێ. قوسەیری ڕۆژێك ئەچێتە لای ئایەتوڵڵا. پشیلەکە لە بەردەم ئایەتوڵڵا

ئەبێ. ئەم قوسەیریشە لە سەر و شکڵا ـ خوا بێقەزای کا ـ زۆر ناشیرینە. بە ئایەتوڵڵا ئەڵێ: قوربان ئەم پشیلەیە زۆر سەیرە. ئایەتوڵڵاش ئەڵێ: «ڕۆڵە، سەیرتر ئەوەیە مەردم ئەیژن: ئایەتوڵڵا کتك و مشکی بەیەکەوە داناوە و کتکەکە هیچ دەم ئابا بۆ مشکەکە!».

٢٤٥. پیاوێك هەبوو لەو شارەزوورە «مامەحەمە»ی ناو بوو. ڕۆژێك یەکێ لە هاوماڵەکانی ئەچێتە لای پێی ئەڵێ: مامەحەمە هاتووم بۆ «ڕەشکە»کەتان، هەندێ کا لە خەرمانەکەمانا ماوەتەوە بیکەمە ناوی و پێی بگوێزمەوە. ئەویش ئەڵێ: بەخوا ڕۆڵە گاڵمان لەسەر هەڵخستووە!. کابرا ئەڵێ: کاکە حەمە گاڵ چۆن لەسەر ڕەشکە هەڵئەخرێ؟ ئەویش ئەڵێ: «ئاخر کوڕم نەدان مەعنای چییە؟!».

٢٤٦. فایق بێکەس جارێك دەورییەك یاپراخ لە بەردەمیا بوو، بە کوێرەکوێر و بە فیزێکەوە ئەیخوارد. عەزیزئەفەندی قامیش هەبوو، ئەچێ بە سەریا پێی ئەڵێ: فایقەکوێر! ئەوە چی ئەخۆی؟ ئەویش ئەڵێ: «بۆیە». ئەڵێ: «بۆیە یانێ چی؟ من ئەڵێم چی ئەخۆی؟» ئەڵێ: «عەزە درێژەی مەدەرێ من لە کورتی ئەیبڕمەوە، تۆ ئەڵێی: چی ئەخۆی؟ من ئەڵێم: یاپراخ. ئەڵێی: بەشم بدە. من ئەڵێم: نایدەم. ئەڵێی: بۆچی؟ ئەڵێم: بۆیە!».

٢٤٧. شێخ مەجیدی شێخ محەمەدی بریندار هەبوو لە سولەیمانی ئەمە ژنی نەهێنابوو. هەر لە خانەقای حاجی مەلا عەلیدا ژیانی خۆی ڕابواردبوو؛ لە گەنجییەوە تا پیری. ساڵی بۆمبۆردمانەکە خەڵکی گەڕەك بە ژن و پیاو و مناڵ و کوڕ و کچەوە لە ترسی بۆردمان

هەموو چووبوونە حەوشەی خانەقاوە. دیارە ئەبێ ئەوە چ ترس و لەرزێك بووبێ ڕووی کردبێتە ئەو عالەمە و هەریەکە ئەبێ لە چ حاڵێکدا بووبن؟ کەچی ئا لەو کاتەدا ئەچێ باوەش ئەکا بە کۆڵەکەی مزگەوتەکەدا و سەیرێکی دیمەنی ئەو زەرد و سوور و بەترسانە ئەکا ئەڵێ: «خەفەت بۆ بێخەفەتی خۆم ئەخۆم!».

٢٤٨. ئەم قسەیە چۆنیەتی ڕۆژێکی کوردەواری پیشان ئەدا: «مەلا لە برسا، فەقێ لە دەرسا، جووە لە ترسا، دۆم بۆ پەڕۆ، کامی خۆش ئەڕۆ؟!».

٢٤٩. کابرایەك لە گوندی «کەسنەزان» لەو سەرشیوی سەقزە، ئەبێ بە میوانی ماڵێك. پاش نوێژی شێوان نان دائەنرێ و نان ئەخۆن. چێشتەکەش شلە بە تورش ئەبێ، کابرای میوان زۆر بە پەرۆشەوە پەلاماری ئەدا و کەوچکی لێ ئەخاتە کار، دەمی ئەسووتێ و نازانێ چی بکا؟ ئەگەر ئەیتفێنێتەوە پێی شەرمە؛ لە ناچاری سەر بەرز ئەکاتەوە و دەمی ئەکاتەوە و سەیری بن میچەکە ئەکا و ئەڵێ: ئەم ماڵە بە چەند دروست کراوە؟ کابرای خانەخوێ هەست ئەکا چ باسە، ئەڵێ: بە دوو فوو و سەبرێك!.

٢٥٠. حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە کچی شێخ کەریمی کۆیی مارە ئەکا. ئەم کیژە لە بارەی خوێندەواری و زیرەکی و دینداریییەوە لە هەموو وڵاتی کۆیە ناوبانگی دەرکردبوو. حاجی مەلا عەبدوڵڵا دێت بۆ کەرکووك بۆلای شێخ عەلی ئەفەندی تاڵەبانی. حاجی مەلا عەبدوڵڵا و شێخ عەلی دەستەبرادەری زەمانی فەقیایەتی ئەبن و وەکوو برا وا ئەبن.

شێخ عەلی ئەڵێ: «کاکەوڵا بیستوومە تازە زاوایت». حاجی مەلا عەبدوڵڵاش ئەڵێ: «بەڵێ قوربان، ژنێکم هێناوە شێخە بە قەدەر عەلی؛ مەلایە بە قەدەر جەلی!».

**٢٥١.** پیاوێك هەبوو پێیان ئەوت: «ئەحەداسنی». لە بناغەدا خەڵکی «مامەخەلان» بوو، بەڵام لە سولەیمانی دائەنیشت. ساڵێك ڕێی ئەکەوێتە ئەستەموڵ. هەر ئەگاتە ئەوێ بە ڕێکەوت حاجی مەلا سەعیدی کەرکووکیزادە تووشی ئەبێ، پێی ئەڵێ: ئەحە، ئەوە کەی هاتووی؟ ئەڵێ وەڵڵا قوربان تازە هاتووم. لە پاش ماوەیەك حاجی مەلا پێی ئەڵێ: ئەحە، لەم وڵاتە شوێنێك هەیە پێی ئەڵێن: «باخچەی گیانلەبەران». شتی سەیری تیایە، وەرە با بچین تۆیش ببینە. ئەویش ئەڵێ: وەڵڵا قوربان بیستوومە باخچەی گیانلەبەران، وە منیش دیومە، ئیتر نایەم؛ شت هەر یەکجار خۆشە عینسان ببینێ، من هەزار جاریشم دیوە. حاجی مەلا سەعید سەری سوڕ ئەمێنێ ئەڵێ: ئەحە، لە کوێ دیوتە؟ ئەڵێ: وەڵڵا قوربان لە سولەیمانی. حاجی مەلا ئەوەندەیتر ئەپەشۆکێ! ئەڵێ: هەتیوە شتی وا کوا لە سولەیمانی؟ ئەڵێ: وەڵڵا قوربان هەیە. ئەڵێ: لە کوێ؟ ئەڵێ: لە ماڵی خۆمان. ئەڵێ: چۆن؟ ئەڵێ: «بەڵێ، کچێکم هەیە وەکوو تاوس بە ڕێدا ئەڕوا، کچەکەیترم وەکوو تووتی قسە ئەکا، کوڕەکەم وەکوو کەمتیار پێ‌ئەکەنێ، ژنەکەم وەکوو هەڵۆ ئەکەوێتە سەرم، کوڕەکەی خەزوورم کە هەموو پێکەوەین وەکوو ورچ ئەبۆڕێنێ، کوڕەکەیتری وەکوو گورگ ئەلوورێنێ، مناڵە فیقنەکەیان وەکوو گوێرەکەی بەهار ئەتووڕێنێ، خەسووم خۆی ئەڵێ: من وەکوو مەیموون وامە، منیش خۆم لە ناویانا وەکوو عەنتەر هەڵئەسووڕام. من کە ئەمانەم هەبێ، ئیتر ئیشم چییە بە

باخچەی گیانلەبەران؟!».

٢٥٢. پیاوێـك لـە «خلك»ـی مستەفای پیرەویسی پرسی: خاڵـە خلـك! ئێستە کوڕەکانـت چـی ئەکـەن؟ وتـی: «بـرا بـوون بـە گەنمی دەساڕی چـەرخ و هێشـتا هـەر لووشەشـی تـێ!» (مەبەستی ئەوەبوو کە مردن و هێشتا ئەم دنیا داوای شتیتر ئەکا).

٢٥٣. کابرایەکی کورد کەرێکی هەبوو تۆپی؛ دەستی کرد بە قوڕپێوان و باوکەڕۆ بـە دەوریا. خەڵکوخوا چوون بە لایەوە پێیان وت: بـرا بـۆچ وا ئەکـەی؟ کەر چییـە پیاو وای بۆ بکا؟ ئەویـش وتی: «برا لێم گەڕێن، کۆستم کەوتگە، بۆ کەرەکە ناگریم، بۆ ئەوە ئەگریم کە کەر وەکەس دەر نەماگە ئیتر وەچی باراشەکەم بهاڕم؟!».



# شەکراوی دەماخ

٢٥٤. مەلا سەعیدی مەنگوری هەبوو پیاوێکی فەقیرۆکە و قسە لەسەرخۆ بوو. وە زۆر کەمیش پێ ئەکەنی. سۆفی ئەولایەکیش هەبوو ئەویش هەر پیاوێکی ساویلکە بوو. جارێك ئەم سۆفی ئەولایە لە مەلا سەعید ئەپرسێ: مامۆستا لە شەرعا دروستە پیاو چاو بنووقێنێ بیر لە ژنێکی‌تر بکاتەوە و بچێتە لای ژنی خۆی؟

مەلاش ئەڵێ: «نا بابە نابێ، دروست نییە؛ تۆ لە سپی خەڵکی ڕەق کەیت و لە ڕەشی خۆتی خەی!».

٢٥٥. ئینگلیز تازە وڵاتی داگیر کردبوو «ئەمین بەگی قامیش» ئەکرێ بە قائیمقام لە چوارتا. خەبەریان دایە کەوا «حاکمی سیاسی» ئەچێ بۆ ئەوێ و پێییان وت: کە جارچی بخاتە ناو شاری چوارتاوە بۆ ئەوەی جاڕ بدا ناو شار پاکوپوختە بکەنەوە.

ئەویش وتی: جارچی بۆ چییە؟ ئەمن خۆم چیمە؟ هەر کردی بە کەڕەکەکەیا و چووە سەربانەکە و بانگەوازی کرد: «هۆ خەڵکی چوارتا! سبەینێ حاکمی سیاسی ئینگلیز «تۆبلێۆت» ناو دێت بۆ ناو دێ. بە ئەمری حەمەدبەگی حاجی ڕەسووڵ‌بەگی مودیر ماڵ، گوێلکۆڵان بیەستنەوە، بەر ماڵ و کۆڵانان پاك بکەنەوە. ئەوی نەیکا هەر بە ئەمری حەمەدبەگی، لە دایەلێ ئەکوتم... ئەمین‌بەگ».

٢٥٦. پیاوێکی ناودار هەبوو لە سولەیمانی برایەکی هەبوو لە ئیش و کاری حوکمەتییا بوو، دەستیان لە ئیش کێشابووە. لە دەرەوەی سولەیمانی ناردبووی بۆلای ئەم برا ناودارەی کە پانزە دیناری بۆ بنێرێ، بۆ ئەوەی پێی بگەڕێتەوە بۆ سولەیمانی. ئەویش ئەم تەلەگرافەی بۆ ئەنێرێ: **«ماذا هذا هي؟ المسالةُ كيفيّة خمسةَ عشرَ دينار بِالبَريد السّليمانيّة، بَيّنْ»** مەسەلە چییە؟ کەیفیەتم بۆ بەیان بکە».

٢٥٧. وەستا بەشیر مشیر گەلێ جار قسەی خۆش خۆشی بۆ ئەکردین، وەکوو لە شتیترا وەستابوو، لە ناودانانیشا هەر وەستا بوو. ڕۆژێك باسی پیاوێك کرا وتی: کابرا ئەڵێی پاڵەوانی حیزە!.

٢٥٨. لەو «ئاڵان»ـە کوڕێك ڕێی ئەکەوێتە ماڵی پوورزایەکی و پێی ئەڵێ: «ئەرێ پوورزا گیان ماشانو بوون؟» ئەویش ئەڵێ: «ئەرێ وەڵڵا پوورزا گیان ماشانو زۆر بوو، بەڵان خێرو لێ نەدی». کوڕە ئەڵێ: بۆچی خێرو لێ نەدی پوورزاگیان؟ ئەڵێ: «وەڵڵا پوورزا گیان پاکن بۆ خۆ خواردن».

٢٥٩. «ئەوڵا ساری» هەبوو خەڵکی «مرانە» بوو. کابرایەکی بەرکێوی لێی ئەپرسێ: مامە ئەوڵا حاڵ و ئەحواڵت چۆنە ئێمساڵ؟ ئەویش ئەڵێ: بەقوربانی حومرێت بم، لە سایەی پرچەکێ دایکتەوە ئیمساڵیش بوومەوە بە کوێخا!.

٢٦٠. کابرایەکی کورد، شێخ بوو بە میوانیان. ماریفەتێکی زۆری لەگەڵ نواند. پاش ئەوەی کە شێخ تۆزێ ماندوویی حەسایەوە هەستا چوو بۆ مزگەوت بۆ نوێژ.

کابراکە چووە ژوورەوە سەیری کرد ـ تانجییەکیان هەبوو ـ تانجییەکە چووە لە شوێنەکەی شێخ لێی کەوتووە. کابرا ڕووی تێکرد وتی: «دە هەستە هەستە بچۆ بەولاوە ئێژی قوروانی لەو سەرەوە دانیشتگی!».

٢٦١. کابرایەك لە ئاواییەکا بەلای ماڵێکا تێپەڕی، سەگی ماڵەکە هات پەلاماری دا. ئەمیش بەردێکی بۆ هەڵگرت و بۆی هاوێشت، دەم و ددانی سەگەکەی شکاند. کابرای خاوەن سەگ کابرای تری کێش کرد و چوو بۆلای مەلا بۆ شکات. هەردووکیان لە بەردەم مەلادا ڕاوەستاون و مەلا لە کابرای بەرداوێژی پرسی: کە چی ئەڵێیت؟ ئەویش وتی: جەنابی مەلا، تۆ ئێستە ئەگەر سەگ بیت لەبۆم بیت و قاچم بگریت چۆن دەست نادەمە بەرد و سی ددانت بشکێنم؟. لە خاوەن سەگی پرسی: تۆ ئەمجا چی ئەڵێیت؟ ئەویش وتی: جەنابی مەلا ئێستە تۆ سەگ بیت و لەبەر دەرگا وەرکەوتبی بەردێکت بە ناو دەمێدا بدەن سێ ددانت بشکێنن ئاخر چۆن بۆی ناچی؟

مەلاش کە ئەمەی دی وتی: سەگەکە گەورە بوو یا گچکە؟ کابرا وتی: قوربان زۆر زل بوو، چوار هێندی جەنابت ئەبوو. مەلا وتی: «کەواتە من کچکەم جارێ ئەم شەرعە بە من ناکرێ».

٢٦٢. مەحمووی مستەفای پیروەیس (خلك) لە عەشیرەتی «یۆسۆجانی» جاف، پیاوێکی دانا و قسە نەستەق بووە. جارێك لەگەڵ بەگزادەیەکی «گەشکی»دا ئەکەونە دەمەقاڵ. بەگزادەکە پێی ئەڵێ: ئەوە بۆچ ئەڵێن ئێوە کە ژن دێنن کچ نییە؟ مەحموویش ئەڵێ: بەڵێ، ڕاست ئێژی. ئێژن: بەگزادەیەك بێوەژنێکی گەشکی هێنا بوو، بەڵێ، ڕاست بوو کەنیشك بوو لە خۆشیانا دەمی برد بەلۆکەی ماچ کرد.

کەنیشکەکەش وتی: ئەوێم ماچ مەکە ئەولاتر ماچ کە ئەگەر ئەو نەبوایە ئەم کوزە بێفەڕە وا بە پوختی نەئەمایەوە بۆ تۆ!». کابرای بەگزادە ئیتر تف لە دەمیا وشك ئەبێ.

٢٦٣. «شافەرەج» هەبوو لە عەشیرەتی وردەشاتری جاف بوو. بارێ گەنم ئەنێری بۆ ئاشی «سەی خەلیل» لەو گەرمیانە بیهاڕن. شەوێ بارە گەنم ئەدزرێت و خەبەر ئەدەن بە شافەرەج. شافەرەج ئەڵێ: کەس دزی من نییە تەرخانی نەبێ؛ ئا مەلا بانگ کەن. مەلا دێت ئەڵێ: مەلا، ئا بنووسە بۆ حەمەحەسەنی ڕەیسی تەرخانی. بنووسە: «حەمەحەسەن ڕەیسی تەرخانی! تکات لێ ئەکەم دێزە سووری خۆت مەهەسوو لە دێزە ڕەشی من. ئەگەر تۆ درنگەت لێوە تێت من زرنگەم لێوە تێت. سوەی وادەمان پشتی "وارگەدرێژە" بێت، نەیژی وە نامەردی هاتە سەرم؛ خۆت و لەشکرت حارز بن یا بارە گەنمەکەم بۆ بنێرەوە... شافەرەجی شاتری».

حەمەحەسەنیش ئەم وەڵامەی بۆ ئەنووسێتەوە: «سەرباشقەی وردەشاتری شافەرەجی لە ڕەچەڵەکی تەرخانی! نووسیوتە: دێزە سووری خۆت لە دێزە ڕەشی من مەهەسوو. برا من گەمەی وا ناکەم تۆ زرنگەت لێوە تێت من خشەم لێوە تێت، تۆ هەسوونی من گورێسم، وە خوام سپاردی... حەمەحەسەنی تەرخانی». لەگەڵ بارەگەنما ئەم وەڵامەی بۆ ئەنێرێتەوە.

٢٦٤. کابرایەك هەبوو ناوی «یووسف شێروان» و لە عەشیرەتی «کەماڵە»یی بوو. لەگەڵ چەند کەسێکی کەلاریدا بە کاروان ئەچن بۆ «قەسری شیرین». پێیان ئەڵێ: «برا من سەرم لە مامڵە و

حساو دەرناچـێ، ئێوە چاوتان لێمەوە بێت. ئەگەر وا نەکەن لەگەڵتان نایێم بۆ شار». ئەڵێن: باشە.

پێکەوە ئەچن تا ئەگەنە قەراخ قەسر. لەوێ ڕێگەکە ئەبێ بە دوو ڕێیانەوە، یەکێ لەو ڕێگایانە بەلای ماڵە خراپەکانا ئەڕوا، یووسف بەو ڕێگایەدا ئەبەن.

یەکێ لە ئافرەتەکان لەناو کۆڵانەکانا چاوی بە یووسف ئەکەوێ ـ یووسفیش تۆزێ جوانکەلە ئەبێ ـ بانگی ئەکا ئەڵێ: کوڕە! کوڕە پیوول بارە بەو کوس بکە!.

یووسفیش پێی ئەڵێ: «دایکم، پارەم نییە هەر ئەوەندەم هاوردگە بەش مامڵەکەی خۆم ئەکا». ژنەکەش ئەڵێ: «بچو قیوون بدە پیوول بارە بەو کوس بکە». یووسف ئەڵێ: «دایکم، بەخوا ئەم ئاتەڵ واتەڵە بە من ناکرێ، بچم قنگ بدەم و پارە بێرم بیدەم وە کوزە بۆگەنەی تۆ. بچۆ وە ڕێتەوە، ڕیشی باوك خۆت و کوزی داقلیشیاگتەوە!»».

.٢٦٥ ئەم شیعرانە لە «حەسەن کەنۆش» شاعیری نەخوێندەواری جافان ئەگێڕنەوە لەسەر شێوەی غەیری جافی:

**جـە بەیانـەوە جـە بەیانـەوە**

**حالـێ پێـم یـاوان جـە بەیانـەوە**

**خالێ دیـم وە بەیـن دوو بەیانەوە**

**چوون نەجـم مەدرەوش وە بەیانەوە**

**حـەکاکان دەور گشـت بەیانـەوە**

**کـێ دیـەن مەغریـب وە بەیانـەوە**

**تا حەسـەن وە خاك سەر مەنیانەوە**

**هەر هام وە حەسـرەت ئەو بەیانەوە**

٢٦٦. ساڵێك لە بەغدا بەند و باوێك داکەوتبوو بە زمانی بەغدایی ئەیانوت: «کورد و عرب فرد حزام» و مەبەستیان ئەوە بوو کە کورد و عەرەب بوون بە یەك و قۆڵیان کردووە بە قۆڵی یەکا و وەکوو بڵێیت یەك پشتێنن و یەك بەرگەیان هەیە؛ واتە هەردوو گیانیان هەیە و لە یەك بەرگدان.

کوردێکی «باوەجانی» لەو سەردەمەدا بە جلوبەرگی کوردییەوە ڕێی ئەکەوێتە بەغدا. یەکێ لە گیرفانبڕەکان ئەچێ باوەش ئەکا بە ملیا و قۆڵ ئەکا بە قۆڵیا و ماچی ئەکاتەوە و پێی ئەڵێ: «کاکە تۆ لە کن من بەرە، من و تۆ یەك حزام، کورد و عەرەب دوو برا خۆش، شیردایك یەك، تۆ لە من بەرە».

بەم قسە خۆشانە ئەیخافڵێنێ و پاشان کابرای باوەجانی ٢٧ دینار و ٧٥٠ فلسی پێ ئەبێ، لێی ئەدزێ و بۆی دەرئەچێ!.

کاتێ کابراکە پێی ئەزانێ پارەکەی نەماوە، تێ ئەگا کابرا عەرەبەکە لێی دزیوە. هیچی بۆ نەمابووەوە ئەیوت: «ئەی بکەم وە قنگ دایك خۆت و "کورد و عەرەب و دوو برا خۆش"ـتەوە! باوەحیزە وەو زوانە بێ فەڕەیەوە هات وە لامەوە ئەیوت: تۆ لە کن من بەرە کەچی لە ژێر یەك پشتێنەوە پارەکەی دزیم. ئەی بکەم وە قنگ دایکتەوە بۆ خۆت و "دوو برا خۆش"ـتەوە! دەویت باوکەی خوا نەناسە، ئەی بکەم وە قنگ ئەم برایەتییەوە!».

٢٦٧. وەستا بەشیری زانا جارێك لەگەڵ دۆستێکی هاوڕێی پەنجا ساڵی خۆیدا دانەیە «کاڵەك» ئەبێ ئەیەوێ پێکەوە بیخۆن؛ دێنێ ئەیکا بە چوار کەرتەوە خۆی ئەنیشێتە سەری سێ کەرتی ئەخوا و

کەرتێکیشی ئەدا بە هاوڕێکەی.

یەکێك لەوێ ئەبێ ئەڵێ: چۆن بەشکردن وا ئەبێ؟ بەشکردن ئەوەیە بیکەی بە دوو کەرتەوە لەگەڵیا. ئەڵێ: کردوومە بە دوو کەرتی تەواوە. ئەڵێ: چۆن؟ ئەڵێ: «ئەو کووزە بخوات و سێ کووزەکەیتریش بکرێنێتەوە. ئەوە وەکوو یەکمان لێ دێتەوە!».

٢٦٨. کابرایەك کوڕێکی هەبوو فێری «سەگەوانی» ئەکرد. کوڕەکەش هەر فێر نەئەبوو. جا باوکەکەی هەڕەشەی لێ ئەکرد ئەیوت: «هەتیو فێر ئەبی فێر ببە، فێر نابی ئەتخەمە حوجرەی فەقێیانەوە. نامەوێ بەو دەردە بتلیتەوە!».

٢٦٩. فەتاحی شەنبە هەبوو پیاوی شێخ ڕەئووفی تاڵەبانی بوو. ڕۆژێك شێخ فەتاحی تاڵەبانی ئەچێ بۆ ماڵی شێخ ڕەئووف و لە دیواخانا دائەنیشن. زۆر تینووی ئەبێ، بە فەتاح ئەڵێ: فەتاح ئەگەر تینووم بێ چیم بۆ دێنی؟ ئەڵێ: ئاوخۆرییەك ئاوت بۆ دێنم. ئەڵێ: ئەگەر تێرم نەخواردەوە؟ ئەڵێ: ئاوخۆرییەکیترت لە سەتڵەکە بۆ دێنم. ئەڵێ: ئەگەر تێرم نەخواردەوە؟ ئەڵێ: ئاوخۆرییەکیتر ئەڵێ: دیسان ئەگەر تێرم نەخواردەوە؟ ئەڵێ: سەتڵەکەت بۆ دێنم لە بەردەمتا دایئەنێم. ئەڵێ: ئەگەر بەوەش هەر تێرم نەخواردەوە؟ ئەڵێ: «ئەمجا ئەتبەمە سەر حەوزەکە و دوو فیکەت بۆ ئەکەم!». ئەویش ئەڵێ: ئەمە هەقی خۆیەتی.

٢٧٠. لەو سەرە پیاوێك هەبوو «شێخ عەلیەکەرە»یان پێ ئەوت. پیاوێکی لەخواترس و نوێژ و ڕۆژوو قایم بوو. گوێشی زۆر گران بوو؛ تا پیاو نەیقیڕاندایە گوێی لە هیچ نەئەبوو. ئیتر ئیشی خوایە ژان و بایەکیش لە سکیا هەبوو، دەستنوێژی زۆر بۆ ڕانەئەگیرا. بەڵام

بەوە ڕاهاتبوو کە بای لێ ئەبووەوە خۆی پێی‌ئەزانی، ئەمە بای لێ بووەتەوە، هەڵئەستا دەستنوێژی ئەشۆردەوە. ئەوەندە هەبوو ئەو هەر بایەکی لێ بیوایەتەوە لەبەر گوێ گرانییەکەی - بلامانێ - بە بای بێدەنگی ئەزانی. لەگەڵ ئەوەدا لەبەر بەهێزی ژان و بایەکە ناشوکری نەبێ قەت ئەو بایەی کە خۆی وای ئەزانی، لێوە نەهاتبوو.

ئەم شێخ حەمەعەلییە پیاوێکی هەبوو «سۆفی‌عەولا»ی ناو بوو. ئەم سۆفی عەولایە ئەوەندە لە دیواخانا گوێی لەو وردە بەزمە بووبوو کە شێخ بە شتێکی‌تری تێ‌ئەگەیشت، گەیشتە جەرگی پێی وت: «یا شێخ ڕۆحم وە فیدات بێ! ئەوی تۆ بە "تس"ی تێ‌ئەگەی "تڕە" با پێت بێژم!».

٢٧١. کابرایەکی کورد لە «قزرابات» حەمەشەریفی ناو بوو، مەعمووری تەل بوو. دوو ژنی هەبوو یەکێکی تورکمان، یەکێکی کوردمان. (تورکمان و کوردمان و زڕەتورك و زڕەکورد).

ئەم ژنانە لەگەڵ حەمەشەریفا هەتا بڵێیت خراپ بوون و بە هیچ جۆر بەقسەیان نەئەکرد، سەرباری ئەوەش درێغییان لە جنێو و فەزیعەتیش هەر نەئەکرد. ڕۆژێك حەمەشەریف لە قرچەی تەمووزا ئەچێ بۆ تەل چاککردن. پانزە ڕۆژی پێ ئەچێ، هیلاك و ماندوو و مردوو ئەگەڕێتەوە. ژنەکانی هیچ گوێی نادەنێ، بەتایبەتی ئەم جارە ژنەکانیش قسە ئەکەن بە یەك کە بە تەواوی گوێی نەدەنێ و بەڵکووماڵەکەی پێ بەجێ بێڵن.

حەمەشەریف کە ئەزانێ ئەم ژنانە وای لەگەڵ ئەکەن، ئەویش هیچ خۆی تێك نادا، بە هەرجۆر بێت ئەو شەوە ڕۆژ ئەکاتەوە. بەیانی زوو شەربە شرێك کە شەوێ لە تەنیشت خۆیەوە دایانابوو پڕی بوو لە ئاو، هەڵئەستێ شەربە ئاوەکە ئەکا بەسەر خۆیا و ئەڵێ: «نیەتمە لەش‌پیسی

خۆم دەرئەکەم».

ژنەکان چاویان لەم کارەساتە ئەبێ هەریەکەیان لە دڵی خۆیانا ئەکەوێتە قینەوە لەوی‌کەیان. ئەو ئەڵێ: ئەوە پیاوەکە لەگەڵ ئەوا ئیشی کردووە و ئەوی‌کەشیان ئەڵێ: لەگەڵ ئەوی‌کەیانا.

لەسەر ئەمە ئەگیرێنە یەك و بەرئەبنە جنێودان بە یەك و هەچ قسەیەکی ناشیرین هەیە بە یەکی ئەڵێن. ئەو بەو ئەڵێ: تۆ دەستی منت کرد بە زاخا، هەی واوا لێ کراو کەچی تۆ خۆت چوویت لەگەڵی دروست بوویت. ئەویش هەروا ئەڵێ بەو. لەسەر ئەمە ئەنیشنە مل یەك و سەروگوێلاکی یەك ئەکوتن.

حەمەشەریفیش لە دوورەوە سەیریان ئەکا و هیچ دەنگ ناکا، ئیتر لە دوای ئەم کارەساتە هەروەخت حەمەشەریف دەرئەکەوت، هەریەکە لە ژنەکانی بە جیا خزمەتیان ئەکرد و هەرکامەیان بە جۆرێکی تایبەتی ئەیەویست خۆی بباتە پێشەوە.

٢٧٢. دوو کابرا لەو سەرە گایەکیان دزیبوو، دابوویانە پێش و بە بەر ماڵە گۆرانێکا تێ‌ئەپەڕن. کابرای خاوەنماڵ تێ‌گەیشت کە ئەم زەلامانە ئەم گایەیان دزیوە؛ ئەویش کردی بە تێلایەکا و دەرپەڕی و کەوتە تەکیان بە تێلاکە ئەیدا لە گاکە و تێی ئەخوڕی و ئەیوت: «وەحە گای هەمووماں». کابراکانیش لە ترسی ئاشکرابوون، نەیانئەوێرا دەنگ بکەن؛ هەر ئەیانوت: «ئەمە چییە؟ ئێژی شملی شەڕی لێمان پەیدا بووگی؟ کەی گای هەموومانە؟» ئەویش ئەیوت: «برا دەنگ مەکەن سەرمایەکەمان بە قەدەر یەکە». هەر لە گایەکەشی ئەخوڕی و ئەیوت: وەحە گای هەمووماں.

**٢٧٣.** کابرایەکی ئەو بناری خۆشناوە ژنێکی هێنابوو، خوا وای بۆ هێنابوو کە هەرچەندە خەریك بوو، نەبوو بە زاوا؛ لەم ڕووەوە زۆر پەرۆش بوو. ڕۆژێك هەروا کز و داماو بە ڕێگەدا ئەڕۆیشت، کەوتبووە ناو دەریایەکی داماوییەوە. پیاوێك هەبوو «مستۆ»ی ناو بوو، دۆستی کابرای بناری خۆشناو بوو، سەیری کرد وا کز و داماوە، لێی پرسی: ئەوە بۆچ وا حاجزی؟ وتی: «برا لۆ حاجز نەبم؟ وا ژنێکم هێنایە هەرچەندە دەکەم لۆم نابێ بە ژن و نابم بە زاوا».

مستۆیش ئەڵێ: ئەی لە منت نەکەوێ لە کوێیە؟ ئەوە تۆ زوو بۆچ دەنگت نەکرد؟ جا برا بە کەڵکی ڕۆژێکی وا نەیە، ئیتر بۆچی چاکە؟ ئادەی بڕۆ پیشانم دە ئەو واوا لێ هاتووە بزانم چۆن نایەڵێ و وا تۆی تووشی ئەم دەردیسەرییە کردووە. ئادەی خێراکە با بڕۆین!

کابرا زۆر بەمە دڵی خۆش بوو، وتی: ئەی لە حەمری منت کەوێ ئەوەتە دەبا بچین. پێش مستۆ کەوت و چوون بۆ ماڵەوە. مستۆیش هەر ئەڵێ: ئەوە ئەو واوا لێ کراوە لە کوێیە؟ کە چوونە ماڵەوە چوونە بەر ژوورەکە کە بووکی لێیە، کابرا وتی: هۆوەتە، مستۆیش بە تووڕەیی و بە گڤەگڤێکەوە لێی چووە پێشەوە و کابراش لە پشت دەرگاکەوە سەیر ئەکا. کە هەر چووە پێشەوە دەرپێکەی داکەند و ـ بلامانێ ـ بووکی کرد بە ژن. لەو کاتەدا بووکێ بایەکی لێ بەر بووەوە، کابرای پشت دەرگا وتی: «ئەوە دەردت بێ، چما ئەویش منم ئا بزانە کووت دەترێنێ!». هەرچەندە پێم دەگوتی: لۆم ڕاوەستە هەر گارتەت پێ‌دەهات، هەنووکە ئەو ئاوهات دەترێنێ، دە بخۆ لۆ خۆت!».

**٢٧٤.** بەزمی بەینی بووك و خەسوو بلوێریش ئەیگێڕێتەوە. بووك و خەسوویەك دەردەدڵ لە یەك ئەکەن بەم جۆرە بە سەروباڵای

یەکا هەڵئەدەن. خەسوو بە باڵای بووکەکەیا ئەڵێ:

کـورت و خـڕ و تـڕ زلـە   فیڕنـە گوڵـەی نـاو زەلـە
باریـك و گێـڕ و چـاو زەقە   دەم تیکلەیـە و کەللـە ڕەقە
گژن، دژوێ، مەیموون ڕەنگە   منگن، چڵمن، کڕ کڕ دەنگە
ئـاش و شـیوی پەڵوولەیـە   پیشـە و کاری چەمۆڵەیـە
ئەقڵـی وردی کڵاشـە ئەکا   هیـچ نەزانـە و گاشـە ئەکا
تاقە کوڕەکەم بێهاوسـەرە   مایەی دەستی دەردی سەرە

ئەمجا بووکێ ئەڵێ:

پیرێژنێکـــە ڕمـــووزن   لەنـاو ماڵایـە گـووزن
ئەسـووتێنێ وەك پنگـر   دڕکـی قسـەی وەك کنگـر
پێـوە ئـەدا وەك دووپشـك   لـە بنەبـڕە وەکـوو مشـك
زیت ئەبێتـۆ وەك قومقومە   ئەسـووڕێتۆ وەك شەمشەمە
ئەشـیتێنێ وەکـوو هـار   ئەکیفێنـێ وەکـوو مـار
باسـی خەسـووم درێـژە   بووکـی هـەژار تیـا گێـژە

٢٧٥. ئەحمەداغای کەرکووکیزادە خانوویەکی هەبوو لە بەغدا دابووی بە ژنێك بە کرێ. لە پاش ماوەیەك ژنە داوای لێ کردبوو بۆریەی ئاوەکەی بۆ چاك بکاتەوە، ئەویش بۆی چاك کردبووەوە ویستبووی تێی بگەیەنێ کە وەکوو ئەو ئەیلێ بۆی چاك کردۆتەوە، بەم جۆرە پێی ئەڵێ: «نگناها و کیف ما ترید خششناها!».

٢٧٦. دوو کابرا بەلای ڕانە مەڕێکا ئەڕۆن، یەکێکیان ئەڵێ: ئێستە من بە قرانێك بەرانێك لەم شوانە ئەسێنم. کابرای هاوڕێ ئەڵێ: چۆن؟ ئەڵێ: چاوم لێ کە.

ئەچێ بەلای شوانەکەوە و ئەڵێ: کاکەی شوان! ئا ئەوە قڕانێك و گێسکە لەڕێکم بدەرێ. ئەویش ئەیداتێ و لێ وەرئەگرێ. ئەڵێ: کاکە شوان! قڕانەکە و گێسکەکە بۆ خۆت بەرخێکم بدەرێ. ئەیداتێ و لێ وەرئەگرێ. ئەمجا ئەڵێ: کاکە شوان! قڕانەکە و گێسکەکە و بەرخەکە بۆ خۆت، بزنێکم بدەرێ. ئەیداتێ و لێ وەرئەگرێ. ئەمجارە ئەڵێ: کاکە شوان! قڕانەکە و گێسکەکە و بەرخەکە و بزنەکە بۆ خۆت مەڕێکم بدەرێ؛ ئەیداتێ. پاشان ئەڵێ: کاکە شوان! قڕانەکە و گێسکەکە و بەرخەکە و بزنەکە و مەڕەکە بۆ خۆت بەرانێکم بدەرێ. ئەیداتێ، لێ وەرئەگرێ و دێتەوە!.

**٢٧٧.** «ئەحەی ناسر» هەبوو، یەکێ بوو لە گۆیندە بەناوبانگەکانی سولەیمانی. ئەم ئەحەی ناسرە هەر لە زووەوە لەلای ئەحمەدبەگی مەحمووپاشا بوو، ڕۆژگارێکی زۆریان پێکەوە ڕابواردبوو؛ بەڵام هەموو خەڵات و بەراتێکی لەلایەن ئەحمەدبەگەوە هەر ئافەرین بوو و هیچی‌تر.

ئەحەی ناسریش ڕووتوقووت و پەرێشان لەمە بە تەواوی وەڕز بووبوو. ڕۆژێـك ئەچێتـە بازاڕی هەڵەبجـەوە و ئەچێتـە سـەر دووکانـی پارچـە فرۆشـێك، دەستـەجلێکی زۆر نایابـی پـێ ئەپێچێنێتـەوە و ئەیداتـە بـن دەستی و برای خاوەن دووکان چاوەڕێی پارەکەی ئەکا. ئەمیش دەست ئەکا بە گیرفانیا و دەستی دەردێنێتەوە و درێژی ئەکا بۆ کابرای دووکاندار. کابراش دەسـت ڕائەکێشـێ پێنج ئافەرین ئەژمێرێتە سەر دەستی. کابرا واقی وڕ ئەمێنێ! ئەڵێ: ئەمە چییە؟ ئەڵێ: برا ئەوە چەند زەمانە لەلای ئەحمەدبەگم، لە ئافەرین زیاتر هیچم وەرنەگرتووە؛ بۆم دەرکەوتووە پارە لەلای ئەو ئافەرینە، ئەوا منیش هێناومە خەرجی ئەکەم. ئەگەر ئەزانی

ناچێ، بچۆ بۆلای ئەحمەدبەگ!.

٢٧٨. کابرایەك لە سولەیمانی گایەك ئەکڕێ بۆ قوربانی. کوڕێکی ئەبێ گاکە ئەدا بە کوڕەکەی بیباتەوە بۆ ماڵەوە. کوڕە گا ئەداتە پێش، سەیر ئەکا لەبەر گەڕی و لەڕێ ناڕوا بە ڕێگەدا ئەڵێ: «تەماشای ئەقڵی باوکم، کە ئەم گایە لەسەر ئەم ڕێگە پان و فراوانەدا ناچێ بە ڕێگادا، ئێستە لەسەر ئەو پردە سیراتە باریك و تەنگەبەرەدا چۆن ئەڕوا بە ڕێگەدا؟! ئەمە ئەڵێ و گاکە بەرەڵا ئەکا و خۆی ئەگەڕێتەوە.

٢٧٩. مەلا محەمەدی ئەوێهەنگی هەبوو، پیاوێکی وەها بوو ئەوەی پێیان بوتایە دنیا و دنیاداری توخنی نەئەکەوت؛ تەنانەت چوار پێنج منالی وردەلەی هەبوو دائما ڕووتوقووت و پەرێشان بوون، ئەمیش هەر بە دڵیا نەئەهات. خواردنی هەرەخۆشیان ئەگەر ببوایە لەپەساوەر بوو ئەگەر نەشبوایە هیچ.

«سید عبدالحکیم»ـی خانەقی لێی ئەپرسێ: مامۆستا ئارەزووی هەرە بەرزت لە دنیادا چییە؟ ئەویش ئەڵێ: «تۆزێ تووتن، سەبیلێك و کەمەکێ پووشوو». سەیدیش ئەڵێ: ئەمە چۆن ئارەزوویەکە؟ پێی ئەڵێ: «کوڕی خۆم، لەمە زیاتر بەش ناکا».

(مەبەستی ئەوە ئەبێ کە دڵ و مێشك بۆ کاروباری دنیا ناتوانێ لەوە زیاتر ئەرك هەڵگرێ).

٢٨٠. لە بەغدا کابرایەکی تورکمان ئەچێتە لای وەستا بەشیری خۆمان داوای زەرفی لێ ئەکا. ئەویش زەرفێکی ئەداتێ. کابرا ئەڵێ: «دەها بیوك». زەرفێکیتری ئەداتێ دیسان کابرا ئەڵێ: «بابم دەها بیوك». وەستا بەشیریش ئەڵێ: «باوکم بیوك بیوکی چیت لێ داناوم. تۆ

زەرفت بۆ ئەوە ئەوێ کاغەزی تێخەی یان جۆی تێکەی!».

٢٨١. ئافرەتێك لەو بەرکێوە بێوەژن کەوتبوو. کوڕێکی منالّی هەبوو ـ بلامانێ ـ کابرایەك بە ژنەکە فێر بووبوو، منالّەکە تازە فامی کردبوو و نەکردبوو منالاّن لەناو کۆلاّنا پێیان ئەوت: کە حەمەدێ بە دایکت فێر بووە. ئەویش ئەهاتەوە لە دایکی ئەپرسی: کە شتی وا هەیە. دایکیشی ئەیوت: ڕۆڵە درۆیە شتی وا ئەگەر هەشبێ بە تەمای خوا، خوا هەقت ئەستێنێ.

کوڕەکە گەورە بوو، قەسەی لە خەڵکوخوا هەر ئەبیست. ڕۆژێك ئەچن بۆ دار کردن. دایکی بە لایەکدا و حەمەدێ زرتەبۆزیش بە لایەکدا.

حەمەدێ ئەچێتە سەر تاشە بەردێك کە بنی هەزار بە هەزارە، دارێك لەوێ ئەبێ بە تەور ئەیبرێتەوە. کوڕەش ئەڵێ: هەلم لەمە چاکتر بۆ ڕێناکەوێ. ئەچێ لە پشتەوە پاڵێکی پێوە ئەنێ و هەپروون بە هەپروون ئەبێ و ئیتر ئەگەڕێتەوە.

دەنگ بلاّو ئەبێتەوە کە حەمەدێ لە داران کەوتۆتە خوارەوە ملی شکاوە و مردووە. ئەمجا دایکەکە بە کوڕەکەی ئەڵێ: «ئا ڕۆڵە نەموت ئەگەر شتەکە واش بێت خوا هەقت ئەستێنێ؟»

کوڕەش ئەڵێ: ئەی قوڕ بەسەر عەقڵت! بەخوا ئەگەر بە تەمای خوا بوایە تا بیست ساڵی کەش هەر ئەیگایت!.

٢٨٢. لەو بەرکێوە کوڕێك دایکێکی تەڕپیری بێوەژنی هەبوو؛ بە ئەمری شەرع دایکەکەی دا بەشوو. دایکەش لە خۆشییا پێی بە عەرز نەئەکەوت. کابرای زاوا پارەی نارد بۆ ماڵی بووکێ کە جیازی بووکێنی بۆ بکڕن. ژنە وتی: کوڕم من خۆم ئەچم بۆ شار بە دڵی خۆم جیاز

ئەکرم. کوڕەش وتی: باشە.

پاش ئـەوە کـە بووکێ بەڕێ کەوت بۆ شـار، کوڕەکـە وتی: بەخوا دایە منیش دێم خوێمان نەماوە بارە خوێیەکیش ئەکرم ئەیهێنمەوە. دایکە وتی: باشە کوڕم.

پێکەوە بەڕێ کەوتن و چوون بۆ شار ئەو جیازی خۆی کڕی و ئەمێش بارەخوێی خۆی کڕی و نای لە گوێرێژێك و گەڕانەوە.

ڕووبارێـك لەسـەر ڕێگـەیانا هەبوو، گوێرێژەکـە نەیئەدا لـە ئاوەکە. بووکێ شتومەکەکانی خۆی دا بە کۆڵیا و پێش کەوت بۆ ئەوە گوێرێژەکە بەشوێن ئەوا بڕوا.

بووکێ قیتە قیت لە پێشەوە ئەڕۆیشت، هەوا هەڵی گرتبوو پەڕییەوە؛ لـە ناوەڕاستی ئاوەکـە کەرەکـە مانی کرد و نەڕۆیشـت. بووکـێ ئاگای لێ نەبـوو لەوبـەر ئاوەکـە بانگی ئەکرد لە کوڕەکەی: کـوڕم تێ‌خوڕە با بێت؛ بەڵام کەر مانی گرتبوو نەڕۆیشت و لە ناوەڕاستی ئاوەکەدا خۆی دا بە زەوییا و خوێکە بە تەواوی تاویایەوە.

ئەمجـا لـەو بـەر ئاوەکـەوە بانگـی ئەکـرد: کـوڕم خێـری تیایـە قەینـاکا گوێرێژەکـە بێنـە و وەرەوە. کوڕەش وتی: «دایە خێری چی تیایە؟ خێری قوزی تۆی تیایە ئەگینا کە خوێکە ڕۆیشـت ئیتر خێری چی تیایە!».

**٢٨٣.** مەلائەورەحمانـی چەرمەڵـە هەبـوو، پیاوێـك لێـی ئەپرسـێ: ئەرێ مامۆستا ڕاستە پیاو ئەتوانێ جن ببینێ؟

ئەویش ئەڵێ: «بەڵێ ڕۆڵە ڕاستە، پیاو بێنێ مێشکی میشوولە و هێلکەی میرووله جوان‌جوان پێکەوە بکوتێ بە کلچێوکی لوولاقی «فیل»، بیهێنێ بە چاویا جن ئەبینێ!».

٢٨٤. کابرایەکی کرمانج لەو بناری دزەییە «سێبەگایی» ئەکا. سێ بەگایی ئەوەیە: کە سێ لنگە «گا»ی هەیە، بە نۆرە هەر جارە تاکەوتاك ئەیانخاتە پاڵ یەك و جووتیان پێ ئەکا. ئەو گایە کە لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ جووتی پێکردووە لە نیوەڕۆ بەدواوە ئەوە بەرەڵا ئەکا و تاکەکەیتر دێنێت کە تا ئەو وەختە حەسابووەوە ئەو ئەخاتە پاڵ ئەم لنگە.

جا ئەم کابرایە لەباتی یەکێ لە گاکان کەرێکی هەبوو، سێبەگاییەکەی بە کەرەکە ئەکرد. لەو وەختەدا کە بەستبووی و جووتی ئەکرد، ئەمین ئاغا هەبوو لەگەڵ چەند خزمەتکارێکیا بەوێدا تێئەپەڕن. کە سەیر ئەکا ئەم کابرایە بە لنگە گایەك و گوێرێژێك جووت ئەکا پێی ئەڵێ: «خاڵە بریا لنگەکەیتریشت «گا»بایە». کابراش ئەڵێ: «ئاغەم گایە هۆ لەوێ». (پەنجە بۆ گا حەساوەکە درێژ ئەکا).

خزمەتکارەکان ئەیانەوێ تووڕە ببن، ئەمین ئاغاش ئەڵێ: «دەستی لێ مەدەن ئەگینا ئەنگۆش دەگێت».

٢٨٥. کابرایەکی کەڵهوڕ لەو موکریانە مەڕوماڵاتێکی زۆری هەبوو. لە زستانا هەچ تفاقێکی بۆ خستبوون هەمووی پێ دابوون، بەو نیازە کە سەرەتای بەهار هاتووە و ئیتر ماڵات دەرئەچێ؛ کەچی لە ناکاو بە بیست شەو دوای نەورۆز بەفرێکی تێ ئەکا ماڵەوماڵ ناکرێ!.

کابرا سەر بەرز ئەکاتەوە بۆ ئاسمان و ئەڵێ: «بڵێم چی و چیت پێ بڵێم. ئەو ئیشانەی تۆ ئەیکەی ئەگەر من بمکردنایە ئێستە حەو زەمان بوو ڕیشیان تاشیبووم و لە "چەخەتو"یش کردبوومیان بەو دێوا!)».

٢٨٦. لە ساڵی غەزا غەزای «عرووس»ـەکەی پێشووا «سالاری ئابڵاخ» لە موکریان، حاجی مەلا عەبدوڵڵایەك هەبوو مەلای

گوندەکەی بوو. ئەچێتە بن دەستیەوە پێی ئەڵێ: ئەمە غەزایە و بۆ دینی ئیسلامە. هەرکە بچێت بۆ ئەو غەزایە ئەگەر بکوژیێت شەهیدە و حەو حۆری لە بەهەشتا ئەدەنێ. ئەگەر خۆ نەشکوژرێ ئەوا ئەبێ بە «غازی» و ماڵ و تالانێکی زۆریشی دەست ئەکەوێ.

بەم قسانە سالار هەڵئەخرێنێ بۆ غەزا، لەگەڵ چەند سوارێکا ئەیاننێرێ ئەچن. ئەو سەرگەرم ئەبێ و عرووس زۆر خراپ دەوریان ئەدەن. جا سالار لەو ئابلۆقەدانەدا ئەیوت: «خوایە تۆ ئەمجارەش شەهیدم مەکە تا دەستم ئەگاتەوە بە دەستی حاجی مەلا عەبدوڵڵا! بزانم ئەگەر غەزا وا شتێ سووك و ئاسانە خۆی بۆچی نەهات و وا بەم جۆرە ملی ئێمەی پێوە کرد!».

٢٨٧. لەو وڵاتی «سوێسنایەتی»ـیەدا کابرایەکی سوێسنی ئەبەن بۆلای مەلا بۆ ئەوە ژنی لێ مارە کا. مەلا، هەندێ شتی فێر ئەکا و پاشان ئەپرسێ: ئەرێ کاکە برا مەزهەب چەندە؟ ئەڵێ: قوربان چوارە. مەلا پێی ئەڵێ: عامفەریم، چی و چین؟

ئەڵێ: «قوربان، مەلکەڕی، بەراجی، باسکی کوڵەسەی، دۆڵی قازانێ».
مەلا ئەڵێ: بەڕاستی باشی ئەزانی و مەزهەب زانین هەر ئەبێ وا بێ.
(ئەم چوار ناوە ناوی چوار شوێن و بەراون لەو وڵاتە)

٢٨٨. «گوڵە» گوندێکە لەو وڵاتی سوێسنایەتییە. مزگەوتی لێیە، مزگەوتەکە مجەورێکی هەبوو «باپیر»ی ناو بوو. ئێوارەی زستانە و خەڵکی دێ لە مزگەوت کۆ بوونەتەوە هەر یەکە داوای شتێکی لە باپیر ئەکرد. یەکێ ئەیوت: ئاوم بۆ بێنە، یەکێ ئەیوت: دار بخەرە ئاگردانەکەوە. یەکێ ئەیوت: کەوشەکانم هەڵگرە، یەکێ ئەیوت: بەڕەکە وا ڕاخە؛ بە

کورتی هەریەکە قسەیەکی ئەکرد. ئەویش هەستا و پەڕییە ناو میحرابەکە و وتی: «هەرسێ تەڵاقی ئەو باپیرە کەوتبێ قسەو نەکەن بە یەك، بە گوێی کەسو ناکەم!».

٢٨٩. دێی «سێ‌گرتکان» هەیە لە وڵاتی «کۆیە». ئەمانە زۆرتر شێوەی قسە کردنەکەیان ئەچێتەوە سەر «هەمەوەن». کابرایەکی خۆشناو بۆ ترێ فرۆشتن ڕێی ئەکەوێتە ئەوێ. سەیر ئەکا چەند پیاوێکی خەڵکی گوندەکە لەسەر بانێك دانیشتوون و قسە ئەکەن. ئەمیش هەرچەندە گوێی بۆ قوت ئەکاتەوە بە هیچ جۆر لە قسەکانیان تێ ناگا. ڕوویان تێ ئەکا و ئەڵێ: «ئم ئم، ما، ئەنگۆ بە شەویش لێ کوو دەگەن؟».

٢٩٠. ژن و مێردێك سێ کوڕی منداڵیان ئەبێ. یەکێکیان هەر زۆر منداڵ ئەبێ لە هیچ تێ‌ناگا. شەوێ خەبەری ئەبێتەوە سەیر ئەکا باوکی وا بەسەر دایکیەوە، لای وا ئەبێ کە ئەمە باوکی دایکی ئەخنکێنێ!. دەست بە برا ناونجییەکەیەوە ئەژەنێ و خەبەری ئەکاتەوە؛ بە شڵەژانێکی منداڵییەوە پێی ئەڵێ: باوکم دایکم ئەخنکێنێ.

ئەو برایە تێ‌ئەگا چ باسە، پێی ئەڵێ: «بنوو، من ئەزانم چی ئەکەن!». کوڕە منداڵەکە لەمە هیچ تێ‌ناگا، برا گەورەکەی خەبەر ئەکاتەوە و بەو ئەڵێ، ئەویش دیسان گەورەترە تێ ئەگا لە کارەسات، ئەویش پێی ئەڵێ: «بنوو بنوو، خۆی ئەزانێ چی ئەکا!».

کوڕە منداڵەکە زیرەك و شەیتان ئەبێ، ئەمیش ئەمجا تێ ئەگا کە مەسەلە چییە ئەڵێ: «بە من ئەزانم و بە خۆی ئەزانێ باوکمتان کرد بە کەڵەگای دایکم، کەواتە ئەمە زەماوەندە». هەڵئەستێ و دەست ئەکا بە هەڵپەڕین. براکانی‌تریش بەم ئیشەی ئەم دەست ئەکەن بە پێکەنین و

ئەبێ بە هەرا. باوك و دایكی قوڕبەسەر ئیشیان لێ تێك ئەچێ و ئەمجا ئەوان خۆیان ئەكەن بە نوستوو!.

٢٩١. جارێك دوو كابرای «زێبار»ی لەو وڵاتەدا لە چۆڵێكا تووشی جوولەكەیەكی چەرچی ئەبن، ئەیگرن و تفەنگ لەسەر سنگی دائەنێن، پێی ئەڵێن: «سەیە موسڵمان بە». جووەش لە ترسی گیانی خۆی ئەڵێ: «ئەزبەنی! چ دبێژن ئەز حازرمە، ئەز نزانم چ بێژم؟» كابراكانیش فیكر ئەكەنەوە، هەرچەند ئەكەن نازانن چۆن موسوڵمانی كەن و بە چی موسوڵمان ئەبێ. لە ئاخرا پێی ئەڵێن: جووە هەرە لای مەلای زرگوێزی ئەو دبێژێتە تە. ئەویش ئەڵێ: «ئەزبەنی! بەسەر چاڤان، ئەز نوكە دچم لنك مەلای وی چ گوت ئەز دبێژم».

ئەوانیش ئەڵێن: باشە و بەرەڵای ئەكەن. جووەش لەباتی ئەوە بچێتە لای مەلای زرگوێزە، ئەچێتەوە بۆ ماڵی خۆی.

٢٩٢. مەلایەك لە گوندێكا ئێوارە لە مزگەوت دانیشتبوو، باسی بەهەشتی بۆ خەڵكەكە ئەگێڕایەوە ئەیوت: بەهەشت پڕیەتی لە كانیاوی سافی ڕوون، لە هەموو لایەكیەوە گوڵ و گیا خەرمانیان داوە. ئەم گوڵ و گیایانە هەر چڵێكیان جۆرە بۆنێكیان هەیە؛ ئەگەر یەكێكیان بكەوێ خێرا یەكێكی‌تر لە شوێنەكەی ئەڕوێتەوە. ئەمانە قەت لە دوایی‌هاتن نایەن.

كابرایەك كە لە كۆڕەكەدا بوو بە تەواوی دڵی دابووە قسەكانی مەلا، هەر لە ناكاو هەڵیدایە و وتی: «ئەی دایكم بە ساقەت بێ مەلا! بەخوا جێی بەرخ لەوەڕاندنە!».

٢٩٣. كابرایەكی خۆشناو چووبووە مووسڵ، هیچ جارێكی‌تر مووسڵی نەدیبوو. گەڕایەوە بۆ وڵات، خزم و كەسوكار دەوریان دا و

باسی مووسڵیان لێ پرسی: کە چۆنە و چۆن قسە ئەکەن؟ وتی: «بە خودای بابم هەموو بە حارەبی قسان دەکەن. تەنها نوێژەکە نەبێ بە کوردی دەیرێن. چ بڕان کوردی گوتن بەسەر زاریانا نایەت!».

٢٩٤. ژنێك هەبوو لە وڵاتی سولەیمانی «باجیتەلیس»ـی ناو بوو. ـ بلامانێ ـ ناوی بە خراپ دەرچووبوو. جا ئەچووە شوێنان و ئەیەویست ئەو ناوە لە خۆی داشۆرێتەوە ئەیوت: ئەیەڕۆ من هێشتا فێری قسە نەبووم، نازانم چۆن ناو و شۆرەتی وا ئەخەنە شوێنم؟ من تەنانەت ئەو خەڵکە ئەڵێن: «داربەڕوولە»، من هەر ئەڵێم: «دار بڕەلوولە». ئێستە من چۆن فرمانیتر ئەزانم؟!.

٢٩٥. دوو کابرای ئەو وڵاتی «دزەیی»یە هاوڕێیی کۆن بوون و چەند ساڵێك لە یەك دوور کەوتبوونەوە. ڕۆژێـك لـە ناکاو لـە دوو ڕێیانێکا تووشی یەك ئەبن و دەست ئەکەنە مل یەك و چاك و چۆنی لەگەڵ یەك ئەکەن. ئەمجا ئەکەونە هەواڵپرسی یەك. یەکێکیان بەوی‌کەیان ئەڵێ: «برا هەنووکە کوویت و کوو نیت؟» ئەڵێ: بەخوا برا زۆر چاکم و لە خودا بەزیاد بێ لە چ شتان ناتەواویم نییە. ئەمجا ئەو لەو ئەپرسێ ئەڵێ: ئەتۆ کوویت؟ ئەڵێ: برا لە من مەپرسە من زۆر خراپم. ئەڵێ: لۆ؟ ئەڵێ: «کوڕە! ژنێکم هەیە ناوی زەمزەمە، سەری بە تەمە و قوونی بە خەمە؛ من هەر لۆی دێنم هەر دەڵێ کەمە. ئەچم دەگەڕێم لەم شار لۆ ئەو شار، شتی لۆ دێنم بە کۆڵ و بە بار. من دەرێم هانێ ئەو دەرێ کانێ».

٢٩٦. مەحمووبەگی ڕەزابەگ ئەیوت: ڕەزابەگ ـ بەڕەحمەت بێ ـ کە ئەکەوتە ڕەمەزان بە ڕۆژوو ئەبوو، بەڵام نوێژی نەئەکرد. لێیان پرسی: میرم بۆچ نوێژ ناکەی؟ ئەویش ئەیوت: «نەوەك فێر ببم!».

٢٩٧. لە ڕاستیدا لە کەلار بە ڕەمەزانان ڕۆژوو بە نوێژەوە باوێکی زۆری هەیە. نوێژ و ڕۆژووەکەی کەلار کابرای قاورمەفرۆشی سولەیمانی بیر ئەخستمەوە. ئەوەش ئەوەبوو: کە کابرایەك هەبوو لە سولەیمانی بەیانیان قاورمەی نۆکی ئەفرۆشت بە دەنگە زولاڵەکەی بانگی ئەکرد: «قاورمەی نۆك بە نانی جوانەوە». کەواتە لە کەلاریش نوێژ بە ڕۆژووی ڕەمەزانەوە!.

٢٩٨. قادربەگی جافرسان لە تەوێڵە سەردەمێك تۆزێ بێ پارەیی بەسەرا هاتبوو. هەورامییەکانیش تەلاق زۆر ئەخۆن، هێنابووی فەرمانێکی دەرکردبوو کە هەرکەس تەلاق بخوا، هەر تەلاقە لیرەیەك جەزایەتی.

قادربەگ دوو پیاوی هەبوو یەکێکیان «کەیکاوس»ی ناو بوو؛ یەکێکیان «هۆمەری مەولوو». ئەمانە بە شەو حەکایەتیان بۆ قادربەگ ئەکرد بۆ ئەوە خەوی لێ بکەوێ. ئەمانەش زمانیان فێر بووە بە تەلاق خواردن و ناشزانن چیش بکەن.

لە پاش دەرکردنی فەرمانەکە یەکەم شەو هۆمەر ملی کەیکاوس ئەگرێ ئەڵێ: ئیمشەو نۆرە حەکایەتی تۆ بێت. قادربەگ ڕاکشاوە و کەیکاوس حەکایەت ئەکا، کوتوپڕ ئەڵێ: «دە ملیۆن تەلاقی ئەم کەیکاوسە کەوتبێ، قادربەگ ئەم حەکایەتە ڕاستە».

قادربەگ کوتوپڕ سەر بەرز ئەکاتەوە و ئەڵێ: «کەیکاوس، ئانە چێش واتەن؟[1]» کەیکاوسیش ئەڵێ: «قادرسان دە ملیۆن تەلاقی ئەم کەیکاوسە کەوتبێ دە ملیۆن لیرە لەم وڵاتی هەورامانەدا نییە». قادربەگ سەیر ئەکا بەم جۆرە بڕوا زۆری ئەوێ لەوانەیە فەرمانەکەی بشکێنرێ. جارچی ئەخاتە

[١. ئەسڵی زمانە هەورامییەکە بەم جۆرەیە: «کەیکاوس، ئانە چێشت وات؟». هەڵەگر.]

ناو شاری تەوێڵە ئەڵێ: «لەو فەرمانەی دەرم کردووە کەیکاوس و هۆمەری مەولووی لێ دەرچێ و ئەوان بەری نەکەون».

بەم جۆرە کەیکاوس و هۆمەر لە دەست قادربەگ ڕزگار ئەکا و ئەمجا بەبێ ترس دەست ئەکەن بە تەلاق خواردن.

٢٩٩. فەقیەشێتە هەبوو لەو بناری هەڵەبجە و شارەزوورەدا بەوەوە گرتبووی: کە بزانێ ئەوە هەر ئەڵێن: هیچ هیچ، هیچ چییە؟ هەرچەندە ئەگەڕا و ئەیپرسی، هیچی بۆ دەرنەئەکەوت؛ هەرشتێك تۆ بیگری لە عاستی خۆی شتێك بوو. هیچ شتێك نەبوو کە شت نەبێ.

ڕۆژێك هەر لە هەڵەبجە بەلای کەلاوەیەکدا تێپەڕی هەر وا لە خۆیەوە سەری کێشایە کەلاوەکە. کە سەیر ئەکا وا کابرایەکی گڕن نیشتووە بە بەر کەرێکەوە. لێی پرسی: ئەوە چی ئەکەی؟ کابرا وتی: «هیچ». ئەمیش وتی: «ها ئەوە ئێستە ئەزانم کە هیچ یانێ کەر گاین!».

٣٠٠. لەو خۆشناوەتییە کابرایەك وەختی خۆی «میر»، ژنێکی بۆ هێنابوو. کابرا ژنەکەی مردبوو، لە سەری پاییزا چووبووەوە بۆلای میر و پێی وتبوو: «میران دەبێ ئەمجارەش خەمێکم لۆ بخۆی». مەبەستی ئەوە بوو: ئەبێ ژنێکیترم بۆ بێنی. میریش پێی ئەڵێ: «خەمی چت لۆ بخۆم؟ مەگەر گوویەکت لۆ بخۆم!».

کابراش ئەڵێ: «بەخودای میرم، ئەگەر ئێستاشم لۆ نەخۆی دەبێ بەهارێم هەر لۆم بخۆی!».

٣٠١. لەو کوردەوارییە هەندێ جاری وا ئەبێ دوو کەس ئەبێ بە شەڕیان، یەکێکیان بەویکەیان ئەڵێ: «دە کەم گوو بخۆ». ئەویکەش زیت ئەبێتەوە ئەڵێ: «کوڕە ئەوە بە کێ ئەڵێی کەم گوو بخۆ؟

خۆت کەم گوو بخۆ!».

٣٠٢. حەسەن بەگ بۆی گێڕامەوە: کە شێخ محەمەدی شێخ «حسام الدّین» گێڕایەوە وتی: شێخ عوسمانی برام لەگەڵ دایکم ئەچوون بۆ حەج و چوونە بەغدا؛ دنیاش هاوینە. وتی: بەیانییەك دایکم پێی ئەڵێ: کوڕم عوسمان، بچۆ ئوتۆمۆبێلێك بگرە با بڕۆین. شێخ عوسمانیش ئەچێت و ئەڕواتە سەر جادە ئوتۆمۆبێلێك دێت. لە دواوە پەلاماری ئەداتێ بۆی ناگیرێ. یەکێکی تر دێت، دیسان ئەیەوێ بیگرێ، هەر بۆی ناگیرێ. بە کورتی تا ئێوارە پەلاماری ئوتۆمۆبێل ئەدا هیچ بە هیچ ناکا! دایکیشی لەولاوە هەر چاوەڕێیە کوڕ بێتەوە و ئوتۆمۆبێل بێنێ و بڕۆن.

ئێوارە شێخ عوسمان ئەگەڕێتەوە بۆلای دایکی، عەرەقی سوور و شینی دەرداوە و ماندوو و مردوو و هیلاك. دایکی پێی ئەڵێ: کوڕم ئەوە ئیمڕۆ لەکوێ بووی؟ خۆ تۆ چوویت ئوتۆمۆبێل بگری و بیهێنی، کوا ئوتۆمۆبێلەکە؟ شێخ عوسمانیش ئەڵێ: «دایە لێم گەڕێ. ئیمڕۆ هەر مردم، لە بەیانییەوە تا ئێستە هیچ ئوتۆمۆبێلێك نەما کە پەلاماری نەدەمێ، ئێستە و ئەوسا ئوتۆمۆبێلێکم بۆ نەگیرا. هیچیان لە وزەی منا نەبوون. دەستم ئەدایە هەر ئوتۆمۆبێلێك لەباتی ئەوە کە من ئەو بگرم، کەچی ئەو منی ڕائەکێشا. لەبەر ئەوە هیچم بۆ نەگیرا!».

٣٠٣. دیسان حەسەن بەگ گیڕاێەوە وتی: شێخ محەمەدی شێخ «حسام الدین» وتی: ئەم دەرمانی «فلیت»ـە تازە هاتبووە عێراقەوە، پڕوپاگەندەی زۆری بۆ ئەکرا؛ بەتایبەتی لە بەغدادا هەرچەند هەنگاوێك ئەڕۆیشتیت ئیعلانێك هەڵواسرابوو لێ نووسرا بوو: «إمشي».

وتی: ڕۆژێك شێخ عوسمانی برام لە بەغدا لە «باب الشّرجي»یەوە

ئەیەوێ بۆ شوێنێك بڕوا، سەیر ئەکا لە قەد کۆڵەکەیەکەوە نووسراوە «إمشی»، دنیاش گەرمای نیوەڕۆیە. پێی لێ ئەکا بە پشتا و ئەڕوا، زۆری پێ ناچێ تووشی کۆڵەکەیەکی‌تر ئەبێ دیسان نووسراوە «إمشی»، ئەوەندەی‌تر هەنگاو توند ئەکاتەوە. بەم جۆرە بینی پێوە ئەنێ تا ئەگاتە «باب المعظّم» هەرچەند «إمشی» ئەبینێ ئەو خێراتر خۆی گورج ئەکاتەوە. لە «باب المعظّم» سەیر ئەکا دوو سێ پیاوی لای خۆمان لەبەر کۆڵەکەیەکا وەستاون و قسە ئەکەن. لە قەد کۆڵەکەکەش نووسراوە «إمشی». ئەویش لێیان تووڕە ئەبێ و ئەڵێ: ئەوە چۆن لێرەدا وەستاون؟ ئەی چاوتان لێ نییە نووسراوە «إمشی»؟ یانی بڕۆ، ئاخر نازانن ئەمە فەرمانی حوکمەتە؟ چۆن نافەرمانی حوکمەت ئەکەن و لێرە ئەوەستن؟ ئەوانیش زۆر سەریان سڕ ئەمێنێ و لە ئاخرا تێ‌ئەگەن کە مەسەلە چییە تێی ئەگەیەنن کە بابە ئەمە مەبەست ئەوە نییە کە بڕۆ. هیچ ئیعلانی حوکمەتیش نییە؛ ئەمە پڕوپاگاندەیەکە بۆ فلیت کە عەرەبەکان پێی ئەڵێن «إمشی».

٣٠٤. کابرایەکی تەمەڵی تەوەزەل کە هیچیشی نەکردبوو، حوکمی خنکاندیان دا. درایە دەست کابرایەکی ورگ‌زل کە بیبا لە دووری شارەوە لە داری بدا. لە ڕێگادا جەلادەکە بە تەمەڵەکەی وت: ئاخر خوا بتگرێ بۆچی ئیشێکی وات کرد لە دارت بدەن و ماڵ و منداڵت بەرەڵای ئەو دەشتە بێت؟ کابرای تەمەڵیش وتی: «کوڕە بڕۆ مردووت مرێ! من ئێستە پوخت و پاکیزە ئەچمە سەر دار و ڕەحمەت ئەبم. بۆ خۆت بگری کە ئەبێ دوو سەعات ڕێگا بگەڕێتەوە دواوەوە!»».

٣٠٥. والییەك کابرایەکی ناچار کردبوو بەوە کە یا ئەبێ گوو بخوا یا ئەیخنکێنێ. کابرا دیارە گووەکە ئەخوا، ئەمجا هەر گووی ئەخوارد

و ئەیوت: «خوایە نمەکی ئەم خانەدانەمان پێ حەڵاڵ کەیت!».

٣٠٦. لە ئاوایی «مەستەکان» کوێخا حەمەی نادر شەوێ هەڵئەستێ بچێت بۆ سەر ئاودەست، کوتوپڕ سەیری کرد وا دزێك لە حەوشەدایە. لێی کرد بە هەرا و دزە هەڵات. حەمەی نادر کەوتە شوێنی، لەو کاتەدا کە دزەکە خەریك بوو لەسەر دیواری حەوشەکە بچێ بەودیوا، حەمە بە شوێنیەوە بوو چمکی کەواکەی گرت و بانگی کرد لە سەپانەکەیان: مارف ئەو گالۆکەم بۆ بێنە. دزەکە گوێی لەمە بوو، لە سەرەوە فیڕاندی بە سەر و ڕیشی حەمەی نادرا. حەمە کە سەیری کرد ئیش گەنە بانگی کرد: «مارف گالۆکەکە دانێ و مەسینەکە بێنە!».

٣٠٧. عەزیزبەگ هەبوو لە سولەیمانی زۆری حەز لە گوڵ ئەکرد، ئەچوو لەملاولەولا تۆی گوڵی پەیدا ئەکرد ئەیهێنا لە مزگەوتەکەی شێخ جەلال ئەیناشت. بەڵام ناشتنەکەی ئەوەبوو کە بەیانیان ئەیناشت و ئێواران هەڵی‌ئەکێشایەوە و لە ژوور سەری خۆیەوە دایئەنا و ئەنوست. پێیان ئەوت: عەزیزبەگ چۆن گوڵ وا سەوز ئەبێ؟ ئەویش ئەیوت: «سەوز نابێ بە کێرمەوە! وڵات تێك چووە، پیاو ئەبێ ماڵی لە ژوور سەری خۆیەوە بێت!».

٣٠٨. کابرایەکی لەو ناو جافە لەبەر ئەوە سکی بای کردبوو نەخۆش کەوتبوو. حەکیمی کوردایەتی ئەو ناوەیان هێنایە سەری. حەکیمەکەش وتی: ئەگەر تا سەعاتێکی‌تر بایەکی لێ بێتەوە ڕزگاری ئەبێ، ئەگینا تازە لە دەست دەرچووە.

خزم و کەسوکارەکانی هەموو لە دەوری کۆ بوونەوە بۆی ئەگریان و دوعایان ئەکرد لە خوا کە شفای بۆ بنێرێ. ئەوا سەعاتەکە بەسەر چوو

هیچ نەبوو، ئەمجا کابرا ئیتر دانکەنی ژیان بوو، دەستی کرد بە پاڕانەوە وتی: «خوایە ئێستە ئەوا بە هەناسە ساردی ئەمرم، تۆ خۆش! بەڵام بە لانی کەمەوە لەو دنیا گۆشەیەك لە بەهەشت و حۆرییەکم بدەرێ». یەکێ لە خزمەکانی کە گوێی لەمە بوو ئیتر پێی هەڵنەگیرا چووە ژوور سەریەوە پێی وت: «هەی کەری کوێستان نەدیگ! ئێمە و خۆت کول بووین لە تەك خوادا ترپێکی پێ ڕەوا نەوینیت. ئێستە لەو دنیا بەهەشت و حۆریت ئەداتێ؟ دە بچۆ بیخۆ!»

٣٠٩. جارێك ئەحەیکرنوو لە سولەیمانی ئەچێتە بەر دەرگای یەکێ لە ئاودەستەکانی مزگەوتی گەورە. تا ئەم ئەیەوێ بچێتە ژوورەوە زەفتیەیەکی تورك پێشی ئەکەوێ ئەچێتە ژوورەوە. ئەحەیکرنوو زۆر ڕائەوەستێ کابرا دەرناچێ. ئەحە ئحەیەکی بۆ ئەکا، کابرا لە ژوورەوە یەکێکی پیا دێنێ؛ ئەحە ئحەیەکیتر ئەکا، کابرا دیسان یەکێکی زلتری پیا ئەکێشێ. ئەحە تووڕە ئەبێ ئەڵێ: «سەگی سەگباب تۆ کە تۆپ و تۆپخانەیەکی وات پێیە و زەخیرەی شەش مانگیشت هەڵگرتووە، بۆچ ناچی یاخی بی لە دەوڵەتی توورك، بە مانگێ مەجیدییەك سەربازی بۆ ئەکەی؟!».

٣١٠. ساڵێك لە هەوەڵی زستانەوە بارانێکی زۆر باری و کە کەوتە بەهار بارانەکەی گرتەوە و تۆزێ شپرزەیی بۆ باران پەیدا بوو. پیاوێك هەبوو «عەلیمامە»یان پێ ئەوت، خەڵکی ئەو وڵاتی خانەقینە و دەروێشی شێخ بوو. کە سەیری کرد عالەم شپرزەن بۆ باران، سەری بەرز کردەوە و وتی: «ئەرێ خوا وە قوروانت وم، بۆچ خۆت نەتئەزانی ئەیە بەشی گەرەکە، هاتی لە هەوەڵەوە چی هەوو نەوو لە خەزێنەکەتا

گشت وەم‌لاو وەولادا پرژاند و ئەوا ئێستە وە دەس حاڵەمەکەوە داماگی، هەرچەن ئێژن وە قوروانت وم چۆڕێ باران، تۆ هەر جواویشیان نادەیتەوە! ئەمە کار بوو تۆ کردت؟».

**٣١١.** حەسەن‌بەگی عەلی‌بەگ بۆی گێڕامەوە وتی: مناڵ بووم کوڕێکی «قەڵخانی» -کە «شامە»ی ناو بوو- لە تیرەی «تفەنگ‌وەشێن» هاتبووە لامان و پیاوی ئێمە بوو. ئەم کوڕە هەر بە مناڵی کەوتبووە لامان و لای ئێمە گەورە بووبوو. قەڵخانی و بە تایبەتی تفەنگ‌وەشێن خواردنی گۆشتی «بەراز» بەلایانەوە وەکوو خواردنی گۆشتی «پۆڕ» وایە بەلای ئێمەوە.

وتی: قەمەرسوڵتانی قەڵخانی ڕۆژێك بوو بە میوانمان و لە ژێر دەوارا دانیشتبووین، خزمەتکار و شتە هاتوچۆیان ئەکرد کوتوپڕ قەمەرسوڵتان چاوی کەوت بە شامە و ناسییەوە. پێی وت: «ها شامە، ئەمە ئەوە لە ماڵی پاشایت؟» ئەویش وتی: «بەڵێ قوروان، سەگەوانی ماڵی پاشام». وتی: «کەواسە کاورا بوویتە سونی»! وتی: «ئەرێ وەڵڵا قوروان بووم وە سونی و هەر چوار فەرزە نەچیونم!».

قەمەر سوڵتان وتی: «کوڕە دەویت باوك چوار نییە پەنجە، وەو ئیمام ئیساقە هەر قەڵخانیت و پاك نەویتەسەوە!».

**٣١٢.** ئوتۆمۆبێل تازە داهاتبوو، دوو ئاغای ئەو سەرە گەلێ جار هاتوچۆی شاریان ئەکرد و لە شاری شاری‌تر بوون. ئەمانە هەریەکە خزمەتکارێکیان هەبوو، هەموو دەم لەگەڵیان بوون؛ ئەمانیش بووبوون بە بەچکە شاری.

ڕۆژێك هەردوو ئاغەکە پێکەوە دانیشتبوون دەردەدڵیان لە بێ‌عەقڵی

خزمەتکارەکانیانەوە بۆ یەك ئەکرد. ئەو ئەیوت: هی من کەرترە؛ ئەوی تریان ئەیوت: نا، هی من کەرترە. ئاخری هاتنە سەر ئەوە کە تاقییان بکەنەوە بزانن کامیان کەرترن. یەکێکیان بانگی نۆکەرەکەی خۆی کرد و پێی وت: «ڕۆڵە! ئوتۆمۆبێلەکەمان کۆن بووە ها ئەوە دە قڕان بچۆ هەر ئێستە ئوتۆمۆبێلێکی فرازیەرزەر بکڕە». نۆکەر وتی: بەسەرچاو! دە قڕانی وەرگرت و چوو بە شوێن ئوتۆمۆبێلەوە.

کە ئەو چووە دەرەوە ئاغەکەی وتی: چاوت لێبوو چەن کەرە؟ ئاخر نالێ چۆن ئوتۆمۆبێل بە دە قڕان ئەدەن؟!

ئەمجا هاتە سەر ئەو ئاغەکەی تر وتی: نۆرەی منە. ئەویش نۆکەرەکەی خۆی بانگ کرد و پێی وت: «ئا ڕۆڵە بچۆرە ماڵەوە بزانە من لە وێم!)». خزمەتکار وتی: بەسەرچاو و چووە دەرەوە. ئاغەش وتی: چاوت لێبوو هی من چەندە بار هەڵئەگرێ؟!

بە ڕێکەوت خزمەتکارەکان لە ڕێگەدا تووشی یەك بوون. ئەوانیش لە بەین خۆیانا دەستیان کرد بە دەردەدڵ کردن لە کەریەتی ئاغاکانی خۆیان. ئەوی ئوتۆمۆبێل وتی: «تەماشاکە ئەم ئاغەی منە چەند کەرە؟ ئاخر نالێ ئیمڕۆ شەنبەیە و شەریکەی شەلەمۆوە جوو دانانیشێ».

ئەوی تریشیان وتی: «کوڕە ئاغەی تۆ باشە، ئاغەی من زۆر کەرە. ئەوەتانێ تەلەفۆنەکە لە بن دەستیەوەیە تەلەفۆن ناکا بۆ ماڵەوە بزانێ خۆی لە ماڵەوەیە، دێنێ هەڵکوت هەڵکوت من ئەنێرێ بۆ ماڵەوە!)».

٣١٣. هەر وا باسی ماڵ و مناڵبوون ئەکرا، فەتاح هەبوو خەڵکی ئەو وڵاتی خانەقییە بوو، وتی: «خەلیل ژنەکەی هەر "دوت" ئەهاورد تا بیون وە هەشت. کاورا لە گیان خۆی عاجباتی هات، بێوەژنەی

تەلاق دا و دوتێکی‌تری هاورد. ئەی کەشە ماشەڵڵا ئەیە دوو دوو دوت ئەهاورد، بە گشتی کار خواس ئایەم نەوت دەس لە کار خوا با!».

٣١٤. شێخ حسێنی قەرەداغی وتی: جارێک کوڕێکی هاوڕێی پەنجەی بریندار بووبوو. کەریم‌بەگ لێی پرسی: بۆچ پەنجەت بریندار بووە؟ شێخ حسێن قەپی لێ گرتووە!؟ کوڕەکە وتی: «نەوەڵڵا، ئێستە ئەوا خەریکە چاك ئەبێتەوە». شێخ حسێنیش ئەڵێ: «بەڵێ، خەریکە چاك ئەبێتەوە، چونکە کەریم‌بەگ لستوویەتەوە!».

٣١٥. شێخ‌ڕەزای تاڵەبانی لەگەڵ ژنێکی هەمەوەندا سەر و سەودای شیعر پەیدا ئەکەن و لە پاشا سەر ئەکێشێتە لای قسە وتن بە یەك. ژنە لە ئاخرا شێخ‌ڕەزا ئەکاتە کون و هەر ئەیەوێ خۆی لێ بدزێتەوە، بەلام ژنە هەر وازی لێ نایەنێ. ئیش وای لێ دێ شێخ بۆڕ ئەخوا و ئیتر بە هیچ جۆر لە هیچ لایەك باسی ناکا. ئەوەندە هەیە ژنەکە هەر لە کۆڵی نابێتەوە.

پێ ئەڵێن: «یا شێخ! ئەمە چییە لە بەینتانا وا بەم جۆرە درێژەی کێشاوە؟» شێخیش ئەڵێ: «وەڵڵا بڵێم چی، نازانم خەڵکی تووشی گون‌ڕەشی خۆیان ئەبن، کەچی من تووشی قوزڕەشی خۆم بووم!» ژنەکە کە ئەمە ئەبیستێتەوە ئیتر وازی لێ دێنێ.

٣١٦. پیاوێ هەبوو لە سولەیمانی «عەلی ئۆفیك»ـیان پێ ئەوت. ساز و سەودایەکی تەواوی هەبوو لەگەڵ عەرەق خواردنەوەدا، هەتا بڵێیت نابووت و لاتیش بوو. هەر کە چەند پوولێکی دەست ئەکەوت، خێرا ئەیبرد ئەیدا بە عەرەق و ئەیخواردەوە.

ڕۆژێك بە هەرجۆر بوو هەشت پوولی دەست کەوتبوو بردبووی

بۆلای عەرەق فرۆشەکە عەرەقی پێ بکڕێ. کابرای عەرەق‌فرۆش ئەڵێ: جا ئەمە چی ئەکا و چ سەرخۆشییەك ئەدا؟ ئەویش ئەڵێ: «هەرچەندە ئەکا تۆ بمدەرێ، سەرخۆشییەکەی لەسەر خۆم!».

**٣١٧.** لە دەوری قاجارەکانا لە ئێرانا هەر ساڵە لە کاتی موحەڕڕەمدا لە هەموو شارەکانا بێجگە لە ڕۆژئاوای، حوکوومەت بە جۆرێکی ڕەسمی ماتەمی «حسێن»ـی ئەگرت، بەتایبەتی هەر ساڵە لە شارێك زیاتر کۆششی لەگەڵ ئەکرا. ئەمەش بەو جۆرە «وەلیعەهد» و گەلێ لە وەزیـر و کاربەدەستە گەورەکانی حوکوومـەت، ئـەو ساڵە ئەچوونە ئەو شارە و ئەمانـەش کـە لـە تارانـەوە ئەچوون پیاوانی تایبەتییان لەگـەڵ خۆیان ئەبرد بۆ گێڕانی دەوری «شمر، یەزید، زیاد، حسێن... و هتد» لە ڕۆژێ دەی موحەڕڕەمدا کە پێیان ئەوت: ڕۆژی «قەتڵ».

ساڵێك ئەم دەورەیە بەر کرماشـان کەوت. «مظفرالدین‌شا» و هەموو سـەرانی حوکوومـەت لـە تارانـەوە بـەڕێ کەوتـن بـۆ کرماشـان و پیاوانـی دەوری قەتڵەکەیان لەگەڵ خۆیان هێنا. یەکێك لەم پیاوانە کابرایەك بوو کە لە ڕۆژی قەتڵا دەوری شمری ئەگێڕا. دیارە ئەمانە هەموو فێر بووبوون و دەرزیان دائەدرا کە چۆن ئەو دەورانە بگێڕن. کابرای شمر کە گەیشتنە نزیکـی کرماشـان نەخـۆش کەوت؛ هەرچەند دەرمانی ڕەوانی و شتیان دایە کەڵکی نەبوو ئاخری مرد. ئەمانەش نەئەکرا بەبێ شمر بڕۆن و تازە دەستیشیان ناگاتەوە بە تاران بۆ ئەوە یەکێکی‌تر لەو فێرکراوانە بێنن. لەم ڕووەوە پەکیان کەوت و کەوتنە تەقەلا دان.

ڕۆژێك لە ڕێگادا کابرایەکی شـوانی «کەڕەك»لەبەری سـمێڵ بابڕێ چوار شانەی کەڵەگەتی «گەڕووسی»ـیان بەرچاو کـەوت. بڕیاریان دا

کە ئەمە لەگەڵ خۆیان بەرن و دەوری شمری لە ماتەمییەکەدا پێ بگێڕن. موزەفەرەدین‌شا ناردی هێنایان و کارەساتەکەیان وت. کابرا وتی: من کابرایەکی شوان چووزانم ئەم ئیشە بکەم و سەرم چۆن لێ دەرئەچێ؟ ئەوانیش بە تەواوی دڵیان پیا چو بوو، وتیان: تۆ هیچ کارت نەبێ جلوبەرگی تایبەتی شمرت لەبەر ئەکەین، لە شوێنێك دائەنیشیت. پیاوێك لە پشت سەرتەوە ئەبێ ئەو دەرزت ئەدا، ئەو چی وت: تۆیش ئەوە بڵێ. بەم جۆرە کابرایان ساز کرد و ڕۆیشتن.

کە چوونە کرماشان و ڕۆژی قەتڵ هات، وەلیعەهد موزەفەرەدین‌شا و وەزیرەکان و هەموو پیاوماقووڵ و گەورە و بچووکێکی کرماشان لە سەرای حوکوومەتیدا کۆ بوونەوە و دانیشتن. کابرای گەڕووسی بەرگی شمریان لەبەر کرد و لەسەر کورسییەك دایان‌نا و پیاوێکی لە پشتەوە دانیشت بۆ ئامۆژگاری کردنی. شوێنی کابرا وا ڕێك خرابوو کە ڕاست ڕووی لە موزەفەرەدین‌شا بێ. پیاوێکی‌تریش کە دەوری «حسێن»ـی ئەگێڕایەوە لە بەرانبەر ئەمەوە دانرا بوو، کە پشتی لە موزەفەرەدین‌شا بوو.

دەور هاتە سەر حسێن و دەستی کرد بە قسە کردن، ئەوەندەی قسە کرد کابرای شمری گەڕووسی دەستی کرد بە وەنەوزدان. لەگەڵ ئەوەشا حسێن لەگەڵ ئەم قسە ئەکا، کابرای ئامۆژگاری‌کەر لە پشتەوە تێی سرەوان: «چورت نەیە چورت نەیە، نوەی تووە». کابرای گەڕووسی شمر وا تێ‌گەیشت کە ئەمە یەکێکە لەو قسانە کە ئەبێ بیڵێت! ڕووی کردە موزەفەرەدین‌شا و بە دەنگێکی نێر وتی: «چورت نەیە چورت نەیە، نوەی تووە». شا و دانیشتووان هەموو ڕاچەنین و سەریان سوڕ ما کە ئەمە چی بوو!.

کابرای ئامۆژگاری‌کەر سەیری کرد وا حەیای ئەو و ئابڕووی هەموویان

چوو، دووبارە سوخرمەیەکی‌تری تیّ‌سرەواندەوە و وتی: «جاکەش پدەر، ریدی وە تازییەکە رِا واکەی؟» شمر وا تێگەیشت ئەمەش هەر لە باقی قسەکەیە رووی کردەوە موزەفەرەدین‌شا و بە دەنگێکی نێرتر وتی: «جاکەش پدەر، ریدی وە تازیەکە رِا واکەی ؟» بەم جۆرە لە شاری کرماشانا قەتڵی ئەو ساڵە تەواو بوو.

٣١٨. کابرایەکی شارەزووری ئەچێ بۆ سولەیمانی و ئەچێتە لای ئەحەی‌کرنوو پێی ئەڵێ: «خاڵەحاجی ئێژن تۆ دەستی حەکیمیت هەیە. بەقوربان من دڵم فرە ژان ئەکا، ئا بزانە خاسم ناکەیتەوە». ئەحەی‌کرنوویش نەختێ لەتکە ناوکی قەیسی بۆ ئەهارێتەوە و ئەیداتێ ئەڵێ: بیکە بە کەفلەمە و بیخۆ، بزانم چەند دەست سکت کار ئەکا، پێم بڵێ جا ئەو وەختە دەرمانی‌ترت ئەدەمێ.

کابرا بەیانی دێتەوە ئەڵێ: «خاڵەحاجی دوو دەستی پرِ و نیوە دەست کار ئەکا». تومەس ئەمە کابرا ئەچێ بە بەرە لەپی لای خواررووی خۆی ئەپێوێ دوو بەرە لەپ و نیو ئەبێ، چونکە لای وا ئەبێ کە ئەو پێی وتووە: «چەند دەست سکت کار ئەکا»! (مەبەستی ئەوە بووە کە سکت چەند بەرەلەپ ئەبێ)

٣١٩. کابرایەك لەو ئالانە ماینێکی هەبوو. بیستبووی لە دێی «گرگاشێ» ئەسپێکی چاك هەیە، ماینەکەی برد لە ئەسپەکەی چاك بکا. خاوەن ئەسپیش هەموو جار ئەسپەکەی بە پێنج مەجیدی ئەپەراند. کابرای خاوەن ماین پێنج مەجیدی دایە و ماینەکەی کێشایە ژێر ئەسپەکە، بەلام وا رێ کەوت ئەسپ لە باتی ئەوە بیکا بە «زێ» ماینەکەدا سەری کرد کردی بە دوایا. کابرا بە ناهومێدی گەرایەوە بۆ ماڵەوە.

دراوسێیەکی هەبوو لێی پرسی: خاڵە، ئەوە دیار نەبووی دوو ڕۆژە لە کوێ بوویت؟ ئەویش وتی: «هیچ دوو ڕۆژە چووبووم بۆ ئەو دێیە پێنج مەجیدی خۆم قەرزار بووم لەگەڵ قنگێکی ماینەکەما هەردووکیمان دایە و هاتینەوە!».

.٣٢٠ ساڵێك «قۆچ‌خان» گەڕانێکی ئاورووپا ئەکا و ڕێگای ئەکەوێتە «پاریس». زۆری برسی ئەبێ کۆشکێکی زۆر نایابی بەرچاو ئەکەوێ کە لۆقەنتە ئەبێ، ئەچێتە ئەوێ. شاگردی لۆقەنتە لیستەی خواردنی بۆ دێنێ، لیستەکە بە فەرەنسی نووسراوە، ـ ئەمیش ئەو سەردەمە هیچی لە خوێندنەوەی فەرەنسی نەئەزانی ـ هەرچەند سەیری لیستەکە ئەکات هیچی لێ نازانێ. ئەو سەروسەکوتەی بەوەوە ئەبێ، پێشی شەرم ئەبێ کە بڵێ: من نازانم بیخوێنمەوە، پێشی شەرم ئەبێ شاگردەکە تێ‌بگەیەنێ کە نازانێ بیخوێنێتەوە. خۆ و بەخت بە فیزێکەوە پەنجەیەك ئەخاتە سەر نووسراوێکی لیستەکە. شاگرد ئەچێت و لە پاش تۆزێك کاسەیە «جلْقاو» لە بەردەمی قۆچ‌خانێك کە خواردنی شەو و ڕۆژی مریشك و شیر و شەکر بووە، ئێستە ئەوا تووشی بوو بە تووشی جلْقاوەوە، دائەنێ. بە ناچاری ئەیخوا، بەڵام لەگەڵ هەموو پاروویەکدا لەوانەیە جەرگ و هەناوی دەرێ.

زۆری پێ ناچێ کچ و کوڕێکی شیکی پاریسی دێن لە بەرانبەریەوە لەسەر مێزێك دائەنیشن. لیستەیان ئەخرێتە بەردەست، لە پاش تۆزێك مێزەکەیان بە گۆشتی مریشکی سوورکراوە و هێلکەی لەناو ڕۆن کراو و شەرابی پاریسی بۆ ئەڕازێنرێتەوە. قۆچ‌خان بە پڕ لە نیگا و بە دڵی پڕ لە دەردەوە سەیری ئەو ناز و نیعمەتە ئەکا. «مسیۆ» و «مسز» بە هەموو

لەزەتێکەوە نان تەواو ئەکەن و ئەمجا ئەڵێن: شاگرد! شاگرد! ڕپتە.

وەکوو خۆت ئەیزانی «ڕپتە» لە فەڕنسیدا یەعنی دووبارەی کەوە. شاگرد چوو لە پاش تۆزێک دەستەیەکیتر لە خواردنەکانی ئەوەڵی هێنایەوە. قۆچ‌خان ئەمەی زۆر پێ‌خۆش بوو وتی: ئەوا زانیم کە ناوی ئەو خواردنە خۆشەی ئەوانە خواردیان «ڕپتە»یە. ئەمجا بە دەست شاگردەکەی بانگ کرد و پێی وت: ڕپتە. شاگرد ڕۆیشت لە پاش تۆزێک کاسەیەکیتر جڵقاوی هێنا لە بەردەمیا داینا.

قۆچ‌خان، یەکەم زۆری برسی بوو، دووەم ئاوی جڵقاو تەبیعەتی تێک دابوو، سێیەم کە ئەمەشی چاو پێ‌کەوت ئیتر هیچ شعووری لانەما، تووڕە بوو هەستا شاگردەکەی دایە بەر زللە و دەستی گرت بردیە سەر مێزی کچ و کوڕەکە و بە جنێودان بە کوردی پێی وت: «باوەحیزەی قنگدەرەی تێ نەگەیشتووە. ئا لەمانە ڕپتە!» و بە دەست دەستی بۆ خواردەمەنی سەر مێزەکە درێژ کرد.

**٣٢١.** لە دێی «زێویە» مەلایەک هەبوو، ڕۆژێک نوێژی نیوەڕۆ بوو دەستنوێژی شتبوو، خۆی ئامادە کردبوو بۆ پێشنوێژی کردن و لەناو میحرابەکە وەستا بوو، بە کابرای بانگوێژی وت: بانگ بڵێ؛ بانگوێژ بانگی دا و کەس هەر دیار نەبوو. مەلا وتی: جارێکیکەش بانگەکە بڵێرەوە. بانگوێژ جارێکیکە بانگی دایەوە، هەر کەس دیار نەبوو.

مەلا لە میحرابەکە ڕاوەستابوو سەیری کرد کەس دیار نییە، هاتە سەر ئەوە خۆی بە تەنها نوێژەکەی خۆی بکا. نیەتی هێنا و دەستی بەرزەوە کردبوو بۆ وتنی «اللّٰهاکبر»ی «تَحَرُّم» لەو کاتەدا بانگوێژەکە هات وتی: دوو جار بانگم دا هەر کەس دیار نییە. مەلا کە دەستی بەرزەوە کردبوو نیەتی هێنا بوو هەر مابووە سەر ئەڵڵاهوئەکبەرەکە وتی: بە کێرمەوە؛ «اللّٰهاکبر».

**٣٢٢.** کابرایەکی هەژار هەبوو لە دێ «گەلاڵە» لەو ئالان و سیوەیلە «سۆفی هەسەن»ی ناو بوو؛ پیاوێکی زۆر بە دینی لەخواترس بوو. لەو زستانە ساردەدا هەموو ڕۆژێ پێش مەلا بانگدان ئەچوو دەستنوێژی ئەشۆرد و ئەچووە ژووری مزگەوتەکە لە خوا ئەپاڕایەوە و ئەیوت: «ئاخر خوایە مەگەر هەر مەحمووپاشای جاف و حەماغای کۆیە و حەمە قەدۆی مووسڵ بەندەی تۆن، وا ئەوەندە ماڵ و مڵکت پێ داون؟ ئایا ئەمانە لە ئێمە پیاوتر و زرنگترن؟ ئەی ئێمە بەندەی تۆ نین وا نانی شەومان نادەیتێ؟ ئاخر ئەبێ بزانم ئەوانەت لە چی دروست کردوون و ئێمە لە چی؟ "نَعوذُ بِاللّٰه" ئەگەر خوایی نازانی وەرە خوارەوە تا من بنیشمە شوێنەکەت و پێت بسەلمێنم کە چۆن موو لە ماست جیا ئەکەمەوە. ئاخر چەند پوولێکیش بە ئێمە بدە تا کاسپییەکی پێوە بکەین».

ئەم کابرایە هەموو شەوێ ئەمە ئیشی بوو. بەم هاتوچۆ کردنەی و بەم پاڕانەوە و دەنگەدەنگەی حەیشی بە فەقیەکان تاڵ کردبوو. چونکە ژووری فەقیەکان لەسەر ڕێبازی ژووری مزگەوتەکە و هەر بە تەنیشت مزگەوتەکەوە بوو. هەرچەندیان ئەکرد بۆیان چار نەئەکرا، فەقێیەکی ئەو موکریانە هەبوو لەوێدا وتی: ئێستە من بۆیان چار ئەکەم.

شەوێك لە پێش ئەوەدا سۆفی هەسەن بێت، فەقیەکە چووە سەر بانی مزگەوتەکە و دوو سێ فەقێیتری لەگەڵ خۆی برد و لەسەر کلاوڕۆژنەکەوە ڕاوەستان. سۆفی هەسەن هات و وەکوو شەوان دەستی کرد بە پاڕانەوە. فەقیەکە لەسەر کلاوڕۆژنەکەوە بە دەنگێکی باریکی نەجیمانە وتی: «ئەی بەندەی ئێمە تۆ چیت داوا کردووە لە ئێمە و نەمانداویتێ؟»

سۆفی هەسەن کە گوێی لەمە بوو لەم ناکاوەدا ئەملاوئەولایەکی خۆی کرد، سەیری کرد کەس دیار نییە، سامێکی لێ نیشت و بێدەنگ [بوو و

دەنگەکە ] قسەکەی وتەوە. سۆفی هەسەن تۆزێ سامەکەی شکا و وتی: «بینایی چاوان، ئێستە تێگەیشتم کە خوایەکی گەورەیت و چاوت لە هەموو کەسێکە. ئێستە هیچم ناوێ هەر ئەمەوێ بمگەیەنیتە حوزووری خۆت».

وەکوو لە پاشا خۆی گێڕایەوە: ئەیەویست کە چووە حوزوور، ڕیشی بگرێت و تۆڵەی هەژاری خۆی لێ بکاتەوە.

فەقێکە سەری گوریسێکی لە کلاوڕۆژنەکەوە بۆ خستە خوارەوە وتی: «ئەی بەندەی ئێمە! سەری ئەم گوریسە ببەستە بە ناوقەدتەوە تا هەڵت کێشین بۆلای خۆمان و بۆ عەرش، ئەو وەختە لە هەموو نیازێك بێنیازت ئەکەین».

سۆفی هەسەن وتی: ئەی بەقوربانت بم وا کەس ناهومێد ناکەی و سەری گوریسەکەی بەست بە ناوقەدی خۆیەوە. فەقێ لە سەربانەوە وتی: توند بەستت بە خۆتەوە؟ سۆفی هەسەن وتی: بەستم بینایی چاوان، ئیشی خۆت بکە.

فەقێ بە یارمەتی فەقیەکانی تر گوریسیان هەڵکێشا. کە چوار پێنج گەزێك بەرزیان کردەوە گوریسەکەیان بەرەڵا کرد و سۆفی هەسەن ترپ، کەوتە سەر زەوی و لە حەیبەتانا تڕێکی زلی کەند. فەقێ وتی: «ئەی بەندەی بێ ئەدەب! ئەوە لە حوزووری ئێمەدا تڕ ئەکەنی؟ سۆفی هەسەن کە بە ژان و ئێشەوە ئەتلایەوە بە ناڵە و نووزەیەکەوە وتی: «بینایی چاوان! جیکە جیك مەکە. ئەگەر تۆ لە شوێنی من بوویتایە، گووت ئەکرد بە خۆتا».

ئیتر ببڕای ببڕای جارێکی کە سۆفی هەسەن لەو وەختانەدا نەچووەوە بە مزگەوتا و فەقیەکان ڕزگاریان بوو لە دەستی.

٣٢٣. کابرایەکی «مارنج»ی کچێکی دابوو بە کابرایەکی «موژژ»ی. شەوێ کە کابرا ئەچێتە پەردە سەیر ئەکا بووکێ کچ نییە و ژنە. ئەچێتـە لای باوکـی کچـەوە دەردەدڵ ئەکا ئەڵێ: قوربان! کچەکەت ژن بوو». باوکی کچ ئەڵێ: «ئەتەوێ پیاو بێ!؟» زاوا ئەڵێ: «مەبەستم ئەوەیە کە کون کرابوو». خەزوور ئەڵێ: «ئەتەوێ بێ کون بێ!؟»

زاوا ئەڵێ: ئەمـەوێ عـەرزت بکـەم کـە کـوزی داوە. خـەزوور ئەڵـێ: «یەعنی ئەتەوێ قنگ بدا!؟» زاوا ئەڵێ: «مەبەستم ئەوەیە کە بە بێگانەی داوە». خەزوور ئەڵێ: «ئەی ئەتەوێ بە باوکی بدا!؟». زاوا ئەڵێ: «قوربان مەبەست ئەوەیـە کـە ئـەم کچـەت قەحبەیـە». خـەزوور ئەڵـێ: «هەی بێئەقڵ کەواتە تۆ بەتەما بوویت کە قنگدەر بێت!»

٣٢٤. لەو سەرە مەلایەك بە منالاَنی ئەخوێند، یەکێ لە قوتابییەکانی دایکێکی جوانی هەبوو بێوەژن بوو. مەلاکە چووبوو بۆ خوازبێنی ئافرەتەکە، شووی پێ نەکردبوو.

لـە سبەینێ ئـەو ڕۆژەدا مەلاکـە دارکارییەکی باشـی کوڕەکەی کرد و پێی وت: هەتیو بۆچی چوویت بە دایکتت وتووە کە مامۆستام کێری زلە؟» کوڕەکە چووەوە بۆ لای دایکی و شکاتی کرد و ئەم قسـەیە بۆ گێڕایەوە. دایکە، کە ئەم قسـەیە بیست ئیتر ساز بوو بۆ ئەوە کە شوو بە مەلا بکا».

٣٢٥. ژنێکی سك پڕ زۆر لە خوا ئەپاڕایەوە کە ئەم سکەی کوڕ بێ، کەچی بە ڕێکەوت کچی بوو. وتی: «خوایە، چی ئەبوو ئەگەر شتێکت لەلای پێی ئەم منداڵەوە دابنایە؟» ژنێکیتر لەوێ بوو وتی: هیچ خەمت نەبێ لە پاش پانزە، شـانزە سـاڵیتر ئەوەندە شت لەلای پێیەوە ئەبینی کە نەتوانی بیژمێری!.

٣٢٦. مەلا ئەورەحمانێکی سەقزی هەبوو گێڕایەوە وتی: ئەوا لە کربچنە لە ژووری فەقیەکانا دانیشتووین چا ئەخۆینەوە. ئەوەندەمان زانی سوارێك لە دوورەوە بە پرتاو هات. هەر گەیشتە بەر حوجرەکە دابەزی و ڕووی کردە حوجرە و وتی: مەلاینە وە قوروانتان وم، با یەکێکتان بێن لە خێڵەکەمان پیاوێك نەخۆش کەوتگە لە ماڵی خۆیایەسی هەر ئیسە یەکێکتان یاسینێکی بخوێنن با بەبێ یاسین و تەڵقین نەوێ وە ژێر خاکەوە.

فەقیەکانیش بە منیان وت: مەلا ئەورەحمان خێرت ئەگا لەگەڵی بچۆ یاسینێکی بخوێنە. وتی: منیش هەستام و کابرا خستمیە پاشکۆی خۆی و ئاوزەنگی تەقێن ڕووە و هۆبە بەرەو دوا بووەوە.

گەیشتینە خێڵەکە و ڕوومان کردە دەوارێك. سەیرم کرد چەند زەلامێك دانیشتوون، هەموو چا ئەخۆنەوە، هیچ نەخۆش و شتە دیار نییە، هیچ بۆنی ئەوەش نایە کە نەخۆش لە ژێر ئەم ڕەشماڵەدا هەبێت؛ پرسیم: کوا نەخۆشەکە؟ سەیرم کرد یەکێك لەناو خەڵکەکەدا ئیستکانێ چای بە دەستەوەیە دانیشتووە ئەیخواتەوە و زۆریش بە دەم و پلە وتی: «برا مەڵا! منم نەخۆش، ئا سەورکە با چایەکەم بخۆمەوە ئەوجا بۆت پاڵ ئەکەوم یاسینەکەم بخوێنە». وتی: زۆر سەرم سڕ ما لەمە! چونکە کابرا هیچ لە نەخۆش نەئەچوو. ئەوەندەم زانی چایەکەی خواردەوە تەقەیەکی لە پیاڵەکەوە هێنا وەکوو ئاسك ڕاست بووەوە و چوو لەولاوە ڕاکشا و وتی: «دە مەڵا بێ یاسینەکەت بخوێنە وە سەرمەوە. یا ئەمەسە ئەمرم و ئەترێم وە گونتا، یا ئەمەسە زلیاوپلیاوێکیتر ئەکەین لەم دەشتی گەرمیانەدا پێش ئەوە بچین بۆ کوێستان!».

٣٢٧. مەلا مارفێکی تایشەیی هەبوو گێڕایەوە وتی: ساڵێك لەگەڵ شێخ مستەفای پێنج ئەنگوسا چووین بۆ ئەو گەرمیانە بۆ دەروێش گرتن. کاتی ئێوارە بوو ڕوومان کردە خێڵێکی باشکی کە تیرەیەکە لە جاف. ڕوومان کردە دەوارێك و هاتن بە پیرمانەوە گێسکێکیان کوشتەوە و مەنجەڵ و حەوجۆش خرایە سەر ئاگر. پاش بەینێك ژنی خاوەن ماڵەکە جامێکی هەڵگرت و چوو بۆ مانگا دۆشین لەولای دەوارەکەوە و لێ نەئەبووەوە. مێردەکەشی ساتێ نە ساتێ بانگی ئەکرد: کچەکە خێراکە شێخ و دەروێشەکان برسییانە، ژنەش هەر لێ نەبووەوە ئەمیش هەر ئەیوت: کەنی ئازاکە، کچەکە ئازاکە، لە ئاخرا ئەوەندە هاواری کرد و هیچ کەڵکی نەبوو بانگی کرد «کچەکە خێراکە وە کەلام خوا دەویت باوك، بێم بۆت بە مێکوت ئەوەندەت ئەکوتم بە کەرە ڕەش بێژی شێخ مستەفا هاوار فریام کەوە. ئەگەر لە ژێر مانگادا نەبی لە ژێر شێخ قادری شێخ کەریمی کەسنەزانا بی ئەتکەم وە داس. خۆ شێخ وەکوو گەماڵە بازگ ئەوەندە کلکی بادا وە دەور چا و چێشتا لە برسانا ئەوا تۆپی. دە بێ وەڕێوە دەویت باوك!»

٣٢٨. هەر ئەم مەلا مارفە ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ: جارێك لەو گەرمیانە لە دێیەك مەلای ڕەمەزان و لە ماڵی حاجی محەمەدا بووم. ئەم حاجی محەمەدە جووتیارێکی هەبوو، ئەسپێك و ئێسترێکی دابوو لە یەك، جووتی پێ ئەکردن. کابرای جووتیاریش ناوی مەحموو بوو. ڕۆژێك جووتەکەی لە نزیك دێکەوە بوو، لای ئێوارە و ڕەمەزان بوو، هەروا وردە وردە لەبەر بێتاقەتی دەرچووم بۆلای مەحموو. مەحموو لەولاوە جووتی بەرەڵا کرد، ئەسپ و ئێستری دایە پێش خۆی و بەرەو

ماڵ گەڕایەوە. سەیرم کرد ئەسپەکە هەموو لەشی بووە بە زام، منیش گەڕامەوە تا گەیشتینە ماڵەوە وتم: مەحموو ئێمڕۆ زوو جووتت بەر دا؟ وتی: «مەلا واز بێرانە، دار و گووت لێ بوارێ وە دەس ئەسپەڕەش و حاجی محەمەدەوە گیرم خواردگە. وەڵڵا ئیمامی ڕەبانی و شێخ غەفووری سۆڵەتێنە لە ژێر ئەم نێرە ون جووت ئەکەن، ئەسپەڕەش وێ ئێمڕۆ جووتی نەکردگە و نایکا. خوا تێڵات لێ نەوارێ ناوی خوای تیا نەوێ من لە کوێ و ئەسپەڕەش و حاجی محەمەد لە کوێ؟»

**٣٢٩.** عێل لەو سەرە بوو. لە دێی «میشیاو» کابرایەکی ڕوغزایی لەوێ مابووە و جێگیر بووبوو؛ دەستی دابوو بە فەلاییەوە. لەبەر ئاواییەکەدا جێگای جووتێ گای کردبوو بە گەنم. گەنم بووبوو بە قەرسیل و کەروێشکەی ئەکرد. گا و گۆتاڵ و کەرگەلی ئاوایی پێی فێر بووبوون. کابرا چاری پێ‌نەئەکرد؛ هەرچەندە دەری ئەکردن هەر ئەهاتنەوە. بە خاوەنەکانیانی ئەوت، کەس گوێی نەئەدایە.

ڕۆژێک سلێمانی حەمەجان ئەچێ بۆ میشیاو بۆ سەر و کاری و چاوپێ‌کەوتنی جووت و بەراوی ئەو ساڵەی. سلێمان‌خانیش زەبر و زەنگێکی هەبوو لەو ناوەدا. دیواخانی بۆ ئەڕازێنرێتەوە و هەموو ئەهلی ئاوایی دەوری ئەدەن. لەو کاتەدا کابرا ئەکا بە دیواخانا و دەست ئەکا بە شکات کردن لە ئەهلی ئاوایی کە هەموو گا و گۆلکیان ئەکەنە ناو دەغڵەکەی ئەمەوە.

بۆ زەبر و زەنگی سلێمان‌خان ئەمە قسەیەکی زل ئەبێ، ناوچاو ئەدا بەیەکا و ئەیەوێ تووڕە ببێ لە ئەهلی ئاواییەکە، کوێخا هەست بەمە ئەکا و ئەڵێ: سلێمان‌خان ئەم کابرایە درۆ ئەکا کەس گا و گۆلکی نەکردۆتە

دەغڵیەوە، خۆی پیاوێکی خراپە ئەیەوێ بەم بیانووەوە لە ئاخرا مڵکانەکە بخوا. کابرا تووڕە بوو هەڵیدایە وتی: «هەی کاورا گۆرانەی بێ‌فەڕە ئەوە تۆ ئێژی چی؟ دەسا سلێمان‌خان وە قەورەکەی مەتحەت هەر کەرێك لەم ئاواییەدا هەیە وەها خۆی هەڵئەشەنگێنێ و ئەچێتە ناو پەڵە و گەنمەوە ئێژی سلێمان‌خانە و ئەچێتە ژێر دەوارەکەی حەمەجانەوە. خۆ بارگیرەکانیان هەر قسەیان وە تەکا ناکرێ، ئێستەش کاورای کوێخا ئێژێ درۆ ئەکا. دەسا درۆزن، بووی وە ژێر کوچك و قسنەکەی شێخی مەولاناواوە ڕۆحم وە قوروانی وێ!» ئێتر سلێمان‌خان هیچی پێ نەوترا.

٣٣٠. پیاوێك هەبوو لە عێلی ڕژدەیی لەو جافە حەمەی خاتوونی ناو بوو، ڕێی ئەکەوێتە «تەنگیسەر»ی قەرەداغ و ئەچێتە مزگەوتەکە. مەلا یووسفی تەنگیسەری سەیری تەفسیری خازنی ئەکرد و کتێبەکەی لە بەردەمیا پان کردبووەوە، حەمەش پێی ئەڵێ: مەلا ئەوە چی ئەکەی؟ ئەڵێ: سەیری تەفسیر و مەعنای قورئان ئەکەم. ئەویش وتی: «ئێ، بەم وە قوروانتان ئەو عالەمە گشتی گیری خواردگە وە دەس ئیش و کاری دوای مێگەلەوە و تۆش هەر گێڕگێڕێ ئەکەی وە سەر قورحان و شەرحەوە ئێژی منیش شتێکم و وەمە بۆ خۆتت بردگەسە سەر. دە بێژم چی وە دەس دنیاوە؟ هەی بەردی تۆی لێ نەوارێ!»



# تاقیکراوەکانی کوردی

٣٣١. کورد تووشی «زەردوویی» ئەبێ بەم جۆرە دەرمانی ئەکەن: ئەم زەردوویییە لە دیوی ناوەوەیە و لە دەریشەوەیە. بەشی دیوی ناوەوەی بەم جۆرە دەرمان ئەکرێ: «ئەهێنن دە مسقاڵ تووتن ئەکەن بە سێ بەشەوە، هەر بەشێکی ئەکەنە پریاسکەیەکەوە و ئەیبەستن. ئەمجا کووپێ شیری مانگا دێنن و یەکێ لە پریاسکەکەی تێئەخەن و شەو لەبەر ساماڵ دایئەنێن تا بەیانی. بەیانی دێنێ پریاسکەکە جوان ئەگوشێتە ناو شیرەکە تا بە تەواوی تووتنەکە تام ئەداتەوە ناو شێرەکە و پریاسکەکە فڕێ ئەدا و کووپە شیرەکەی ئەخواتەوە. ڕۆژی دووهەم و سێهەمیش دوو پریاسکەیتر وا لێئەکا و شیرەکەی ئەخواتەوە بەم جۆرە لە دەردی ناوەوەی زەردوویییەکە ڕزگاری ئەبێ».

٣٣٢. ئەڵێن: شیرەی ئەسپەناخ لەگەڵ شەکر تێکەڵاو بکرێ و بخورێ بۆ لاچوونی زەردووی بە کەڵکە.

٣٣٣. ئەڵێن: یەکێ «گەنەکەوڵە» بیگەزێ، شووتییەکی سووری گەیشتوو بێنن بیکەن بە دوو کەرتەوە، لە پاش ئەوە کە هەڵکۆڵران، ئاوەکەی بگرن و بیکەنە ناو یەکێ لە کەرتەکانەوە، ئەمجا بێنن ئەوەندەی شیری «خوشیلك» تێکەن کە ڕەنگی ئاوی شووتییەکە بگۆڕێ و بیکا بە دوو ڕەنگ، پاشان بیخواتەوە چاك ئەبێتەوە.

٣٣٤. ئەڵێن: یەکێ «گرفت»ـی گرتبێ شیری «خوشیلك» لەگەڵ ئاردی جۆ بکرێ بە هەویر پاشان بیکەن بە حەب دوو سێ حەبی لێ بخوا چاك ئەبێتەوە.

٣٣٥. ئەڵێن: یەکێ تازە سەرەتای «گۆجی» (ئیفلیجی، شەلەل)ی بێ، بێنێ برکی «قانگ» ـ واتە بڕکە تەڕەکەی ئەوەی کە تۆوی قانگ ئەگرێ ـ جوان جوان بیکوڵێنێ هەتا خەست ئەبێتەوە. ئەمجا هەڵیسوێ لەو جێگەیە کە نەخۆشییەکەی تووش بووە، چاك ئەبێتەوە. ئەگەر جارێك بەشی نەکرد چەند جارێك بیکا چاك ئەبێتەوە.

٣٣٦. ئەڵێن: برنج کە ئەیکوڵێنن بۆ «پڵاو» ئەو ئاوەی کە دایئەهێڵن، منالێ کە کۆکەی هەبێ ئەو ئاوەی بدەنێ کۆکەکەی نەرم ئەبێ و چاك ئەبێتەوە.

٣٣٧. ئەڵێن: یەکێك کە تووشی «کۆکەڕەشە» بوو، قەلەباچکەیەك بێنن لە پاش ئەوە کە کوژرا، بە پەڕ و گۆشت و ئێسقانەوە بیکوتن جوان جوان؛ پاش ئەوە بیکوڵنن تا تەواو وەکوو مەعجوون تۆزێ ئاوی لێ پەیدا ئەبێ. ئەو ئاوەی ئەبێ بیدەن بە کۆکە ڕەشەدارەکە چاك ئەبێتەوە.

٣٣٨. ئەڵێن: یەکێ قرژاڵ گازی لێ بگرێ تا کەر لە بەغدا نەزەڕێنێ بەرەڵای ناکا.

٣٣٩. ئەڵێن: هەرکەس زۆر تەزبێحی «یوسر» هەڵبگرێ وەجاخی کوێر ئەبێ.

٣٤٠. ئەڵێن: هار، چاوی بە ئاو بکەوێ هارتر ئەبێ.

٣٤١. ئەڵێن: گۆشتی گا کە هەر نەکوڵا، تۆزێ چای وشك ئەکەنە ناو مەنجەڵەکە دایئەڕزێنێ.

٣٤٢. ئەڵێن: مار کەڕە و دووپشك کوێرە.

٣٤٣. ژنانی کوردەواری ئەڵێن: بتەوێ بزانی چ کچێك بە سەروبەرە بۆ ماڵ و گورجوگۆڵ و ماڵداری کەرە بۆ ماڵی مێرد، لە کاتی نانخواردنیا سەیری بکە: ئەگەر گورجوگۆڵ بوو لە نانخواردنا ئەوا ئافرەتێکی تەواوە؛ ئەگەر خاو و خلیچك بوو، ئەوە بە کەڵکی ماڵ نایە.

٣٤٤. ئەڵێن: ئەگەر بتەوێ جوانی و زمانشیرینی ژن تاقی بکەیتەوە لەو وەختەدا کە بەیانیان لە خەو هەڵئەستێ سەیری بکە، ئەگەر جوان بێ دەرئەکەوێ، ئەگەر زمان شیرینیش بێ هەر دەردەکەوێ.

٣٤٥. ئەڵێن: قارچکی کەما بێنن وشکی کەنەوە پاشان لەگەڵ شەکردا بیهاڕنەوە. ئەو کەسەی کرمی هەیە بەیانیان لە خورینی لێ بکا بە کەفلەمەوە بیخوا هەموو کرمەکانی ئەخا.

٣٤٦. لە بارەی «کەمتیار»ەوە ئەڵێن: ساڵێ نێرە و ساڵێ مێ. دوژمنایەتییەکی پیس هەیە لە بەینی ئەو و سەگدا، تەنانەت ئەگەر سێبەری بکەوێتە سەر سەگ لە ترسی ئەوە کە نەوەك بیخوا ڕائەوەستێ.

هەرکەس زمانی کەمتیاری پێ بێ، سەگ پێی ناوێرێ. زمانی بەسەر دەرگای ماڵێکا هەڵواسن کە ئەو ماڵە شادی و زەماوەندی تێدا بێ هیچ پشێوییەك لەو شادییەدا پەیدا نابێ.

هەرکەس «کەڵبە»کەی هەڵگرێ و پێی بێ هیچی لە فیکر ناچێ.

ئەگەر «دڵ»ـەکەی بکرێ بە منداڵا، ئەو مناڵە زیرەك دەرئەچێ و زوو فێری شت ئەبێ.

ئەگەر «مێشك»ـەکەی بهێنرێ بە برۆدا هەرکەسە ئەو خاوەن برۆوە ببینێ خۆشی ئەوێ.

«دەستی ڕاستی» ئەگەر ژن لە وەختی مناڵ بوونا بیبەستێ بە قۆڵیەوە بە ئاسانی مناڵەکەی ئەبێ.

«چەمۆڵە»کەی ئەگەر بە هەر دارێکی بەردارا هەڵبواسرێ مەلی زیاندار توخنی ئەو دارە ناکەوێ.

«کوز» و «پێستی ناوکی» بە لای هەر پیاوێکەوە بێت هەر ژنێك سەیری بکا عاشقی ئەبێت و هەروەها بەلای هەر ژنێکیشەوە بێت هەر پیاوێك سەیری بکا عاشقی ئەبێت.

ئەگەر پێستی کەمتیار بکرێ بە بێژنگ و گەنمی پێ بێژنەوە ئەو گەنمە کە کرا بە «تۆ» و چانرا، نە کوللە توخنی ئەکەوێ نە تەیروتیوور.

«پشقل»ـەکەی لەگەڵ ڕۆنی «ئاس»دا تێکەڵاو بکرێ سەری بێ تووکی پێ بهەنوون، تووکێکی جوان دەرئەکا.

٣٤٧. ئەڵێن: یەکێ مەقەست بدا بە دەست یەکێکی ترەوە ناکۆکی و ناخۆشی ئەکەوێتە بەینیان. جا بۆ ئەوە ئەمە ڕوو نەدا دێنێ ئەو کەسە کە مەقەستەکەی بە دەستەوەیە و ئەیەوێ بیدا بەوی تر دەستی هەڵ ئەگێڕێتەوە مەقەستەکە ئەخاتە سەر پشتی دەستی ئنجا ئەوی کە هەڵی ئەگرێ!.

٣٤٨. ئەڵێن: مەڕ کە بە جۆ بکەوێ ـواتە: جۆی زۆر بخوا و بیکرێـ بخرێتە ناو ئاوەوە چاك ئەبێتەوە و بەری ئەدا.

٣٤٩. ئەڵێن: کەر دەستی کرد بە زەڕین سەگ پشتی دێتە ژان.

٣٥٠. ئەڵێن: ئەگەر کەر زۆر زەڕی شتێك بئاخننە گوێیەوە ئیتر نازەڕینێ.

٣٥١. ئەڵێن: ئەگەر بەرازی تینوو بخەنە سەر کەر ـ واتە بیکەن بە باری ـ هەر کە کەرەکە ئاوی خواردەوە بەرازەکە ئەتۆپێ.

٣٥٢. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ خەوی لێ نەکەوێ ـ واتە دژەخەو بێ ـ ددانی کەر بخاتە ژێر سەری خەوی لێ ئەکەوێ.

٣٥٣. ئەڵێن: ئەگەر ژنێك شیری کەم بوو «سپڵ»ـی کەروێشك بکاتەوە و بیهاڕێ و گۆی مەمکی خۆی پێ بهەنوێ شیری زیاد ئەکا.

٣٥٤. ئەڵێن: کەر لەو وەختەدا کە ئەزەڕینێ ئەگەر بەردێك ببەستن بە کلکیەوە، ئیتر نازەڕێنێ.

٣٥٥. ئەڵێن: ئەگەر منداڵێك زۆر گرینۆك بوو، پارچەیەك لە پێستی ناوچەوانی کەر بکرێ بەو منداڵەدا ئیتر ناگری.

٣٥٦. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ خوێنی لووتی پژا و هەر نەئەوەستایەوە هەندێ سرکە بکرێ بە سەر تەرسی کەرا و ئەو کەسە بۆنی پێوە بکا خوێنەکەی ئەوەستێتەوە.

٣٥٧. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ دووپشك پێوەی بدا بەرەواژە سواری کەر ببێ ژانەکەی نامێنێ.

## ڕێوی

٣٥٨. ئەڵێن: ئەگەر شوێنێ کۆتری زۆری لێ بوو ویستیان کۆترەکان بڕۆن سەری «ڕێوی»ـیەك لەو شوێنە دابنرێ ئیتر کۆترەکان ئەڕۆن.

٣٥٩. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ فێی لێ بوو، زراوی ڕێوی بێنن سەرێکی بخەنە لووتی کابرای فێدارەوە و فوو بکرێ بە سەرەکەی‌تریا ئیتر جارێکی‌کە ئەو کەسە فێ نایگرێتەوە.

٣٦٠. ئەڵێن: خواردنی گۆشتی ڕێوی بۆ «گول» باشە؛ واتە لە گولی ئەکەوێ.

٣٦١. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ جمگەکانی ژانی کرد، پیوی ڕێوی بتوێننەوە و ئەو جمگانەی پێ بهەنوون چاك ئەبێتەوە و ئیتر ژانی نامێنی.

٣٦٢. ئەڵێن: ئەگەر هێلکەگونی ڕێوی بکرێ بە شوێنێکی منالا ـ واتە پیا هەڵواسرێ ـ ئەو منالە زۆر بەبێ ئازار دان دەرئەکا.

٣٦٣. ئەڵێن: ئەگەر بە خوێنی ڕێوی سەری منال بهەنوون سەری موو دەرئەکا، ئەگەر کەچەڵیش بێت.

٣٦٤. ئەڵێن: ئەگەر کەڵبەی ڕێوی ـ واتە ددانەکانی تەنیشتی ـ هەڵبواسرێ بە «فێدار»دا فێیەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

٣٦٥. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ سپڵی هەبوو ئازاری ئەدا، سپڵی ڕێوی بخاتە سەر، لە کۆڵی ئەکەوێ.

۳٦٦. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ گوێی هاتە ژان، پیوی ڕێوی بتوێننەوە و تێی کەن ژانەکەی ئەشکێ.

۳٦٧. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ ئازاری سپڵی هەبوو، تۆزێ لە دڵی ڕێوی تێکەڵاو بکا لەگەڵ بە ئەندازەی مسقاڵێ شەراب و بیخواتەوە ئازارەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

۳٦٨. ئەڵێن: ئەگەر مێشکی ڕێوی لەگەڵ «وەرەس» تێکەڵاو بکرێ ئەو کەسەی کە سەری کرێژی هەیە وەیا زیبکەی هەیە، وەیا کەچەڵە، وەیا مووی ئەڕزێ، بەو دەرمانە بیهەنوێ، ئەوانەی هەموو لە کۆڵ ئەکەوێ. (وەرەس: گیایەکە لە یەمەن ئەڕوێ تۆوەکەی وەکوو تۆوی کونجی وایە کە گەیشت، شەق ئەبا و هەودای وەکوو زەعفەرانی لێوە دەرئەچێ. بەو هەودانەیە شت ڕەنگ ئەکەن).

## گورگ

۳٦٩. ئەڵێن: ئەگەر سەری گورگ هەڵواسن بەو شوێنەدا کە کۆتر و پەلەوەری لێیە، نە پشیلە و نە دەعبای‌تر ناچێتە ئەو شوێنە بۆ خواردنیان.

۳٧۰. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ کەڵبە وە یا چاو وە یا پێستی گورگی پێ بێ زاڵ ئەبێ بەسەر دوژمنیا و هەموو کەسیش خۆشی ئەوێ.

۳٧١. ئەڵێن: ئەگەر کلکی گورگ لە «کادان»ـدا بێ، نە گا نە کەر نە مەڕ و نە بزن ناچن بۆ خواردنی ئەو کایە.

۳٧٢. ئەڵێن: ئەگەر پێستی گورگ و مەڕ پێکەوە کۆ بینەوە هەموو تووکی پێستە مەڕەکە هەڵئەوەرێ.

٣٧٣. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ بیکا بە عادەت و هەر لەسەر کەوڵی گورگ دانیشێ تووشی کۆڵنج نابێ.

٣٧٤. ئەڵێن: ئەگەر پێستی گورگ بکرێ بە تەپڵ، ئەو تەپڵە لەناو هەرچەند تەپڵی‌ترا بێ کە لێ درا هەموو تەپڵەکانی‌تر ئەدڕێن.

٣٧٥. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ تووشی مەوەرزە بوو بە پیوی گورگ خۆی بهەنوێ ئەو دەردەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

٣٧٦. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ «فێدار» بوو چاوی گورگ هەڵبگرێ لەگەڵ خۆیا فێدارییەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ.

٣٧٧. ئەڵێن: گووی گورگ وردە ئێسکی تێدایە وەکوو تەرسی گا و وشتر. جا ئەگەر یەکێ ددانی هاتە ژان یەکێ لەو وردە ئێسکە بهێنێرێ بە ددانیا ژانەکەی ئەشکێ.

٣٧٨. ئەڵێن: ئەگەر تۆزێ لە زراوی گورگ لەگەڵ تۆزێك هەنگوینی ئاگر نەدیودا تێکەڵاو بکرێ و بهێنرێ بە چاوا شەوکوێری و کەم‌حوکمی چاو لائەبا.

٣٧٩. ئەڵێن: ئەگەر کلکی گورگ بە ناوی ئافرەتێکەوە گرێ بدرێ ئەو ئافرەتە کەس ناتوانێ بچێتە لای تا ئەو گرێیە نەکرێتەوە، واتە کابرا ئەبەسترێ.

٣٨٠. ئەڵێن: گورگ کە بریندار کرا و خوێنی لێ‌هات و ئنجا ڕۆیشت، گورگی‌تر کە چاویان پێ‌کەوت ئەیخۆن.

٣٨١. ئەڵێن: ئەگەر تووشی ڕەوە گورگ بوویت و پەلاماریان دایت ئیشێکی وا بکە یەکێکیان لێ بریندار کەیت. هەر کە خوێنی لێهات ئیتر گورگەکانیتر بەر ئەبنە ئەو، ئەو ئەخۆن و واز لە تۆ دێنن، بەو جۆرە تۆ ڕزگارت ئەبێ.

٣٨٢. ئەڵێن: یەکێ کە بەرد لە میزڵدانیا بوو گوڵی گەنمەشامی بۆ بکوڵێنن وەکوو چا بیخواتەوە بەردەکەی نامێنێ.

٣٨٣. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ خوێنی لووتی پژا، بۆن بە تەرسە قولەوە بکا خوێنەکە ئەوەستێتەوە.

٣٨٤. ئەڵێن: ئەوی «ئاگرە»یەتی، ئەستێ بێنن و کابرایەك کە گورگی کوشتووە ـ بە کوردی ئەڵێ ئەبێ بە دەستی بێ ـ بێنێ پڕ دەمی بکا لە ئاوی سماق و بیپرژێنێ بەو شوێنەدا کە ئاگرەکەی لێ هاتووە. پاشان بە بەرد و ئەستێ لەبەر برینەکەدا بەرد و ئەستێیەك هەڵبکا پزیسکی بەرد و ئەستێیەکەی لێ بکەوێ ئیتر چاك ئەبێتەوە.

٣٨٥. ئەڵێن: ئەو منداڵەی کە تووشی «خەرکانە» ئەبێ، ژنێك کە بە دەستی بێ، بێنێ پارچە کاغەزێکی شینی شەکر ئەخاتە سەر ناو چەوانی منداڵەکە و «عەقیق»ێك گەرم ئەکا و ئەیخاتە سەر کاغەزەکە؛ خەرکانەکە وشك ئەکا. ئەم ئیشەش ئەبێ لە ڕۆژی چوارشەممەدا بێت.

٣٨٦. ئەڵێن: ئەو منالەی تووشی برینی «ئاگرە» ئەبێ بێنن «جۆ» لەسەر ساج بسووتێنن پاشان سماق، ناوکەکەی لێ بکرێتەوە، توێکڵە تورشەکەی لەگەڵ ئەو جۆوە سووتاوەدا پێکەوە بیانکوتن و لێی بنێن، چاك ئەبێتەوە.

٣٨٧. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ چاوی ژان بکا و بئاوسێ و ئاو بکا، بەز و گۆشت پێکەوە بکوتن و بیخەنە سەری چاك ئەبێتەوە.

٣٨٨. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ چاوی تێك بچێ و ژان بکا و بئاوسێ سەر تۆی ماست بخەنە سەر لۆکە و شەوێ لە کاتی نوستندا بیخەنە سەری چاك ئەبێتەوە.

٣٨٩. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ چاوی تێك چوو بێنێ سەرگوڵی چای کە لێ ئەنرێ لەناو ژێرپیاڵەیەکدا ساردی کاتەوە دوو سێ جار، هەر جارە یەك دوو دڵۆپی تێکا، چاك ئەبێتەوە.

٣٩٠. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ چاوی تێك چوو «تلّپە» چای بگوشێ و بە شەو بیخاتە سەر چاوی و بیبەستێ، چاك ئەبێتەوە.

٣٩١. ئەڵێن: ئەگەر یەکێك «موو» لە پەنجەی هات «بنێشتەتاڵ» لەگەڵ «سابوونی ڕەقی» سابوونەکە ورد بکرێت و پێکەوە بکرێن بە مەعجوون و لێی نێن، چاك ئەبێتەوە.

٣٩٢. ئەڵێن: شیرەی ئەسپەناخ و شەکر تێکەڵاو بکرێن و بخورێن ژانە سەر لائەبا.

٣٩٣. ئەڵێن: یەکێ میزی بگیرێ ئەسپەناخ بە کاڵی بخوا میز گیرانەکەی لائەچێ.

٣٩٤. ئەڵێن: یەکێ گەروو و مەلاشووی ژان بکا گیای ئەسپەناخ بە کاڵی بخوا ڕزگاری ئەبێ.

٣٩٥. ئەڵێن: یەکێ شەنگەسوورە و زەردەواڵە پێوەی بدا ئەسپەناخ بکوڵێنن و بیخەنە سەر شوێنەکەی چاك ئەبێتەوە.

٣٩٦. ئەڵێن: یەکێ دومەڵی لێ هاتبێ هەر دەرگای نەبێ، هەندێ ئەسپەناخی کوڵاوی بخرێتە سەر زوو دەرگای ئەبێ.

٣٩٧. ئەڵێن: خواردنی گیای ئەسپەناخ بۆ نەخۆشی سنگ و وەرەم و تای گران و تینوێتی زۆر بە کەڵکە.

٣٩٨. ئەڵێن: یەکێ سپڵی هەبوو خۆی لە خواردنی ئەسپەناخ بپارێزێ.

٣٩٩. ئەڵێن: گیانلەبەری گەڕ لە هەرکە بکەوێ ئەو کەسە تەمەنی کورت ئەبێ.

٤٠٠. ئەڵێن: یەکێ خەوی دی بە شەو نەیگێڕێتەوە، وە ئەگەر یەکێکی وای دەست نەکەوت کە بزانێ چۆن بۆی لێك ئەداتەوە، لەسەر ئاوێکی ڕووناك و پاك بیگێڕێتەوە.

٤٠١. ئەڵێن: ئاوی دەباخانە و ئاوی نێرگەلە برێژرێتە ماڵێکەوە کە جادووی تیا کراوە جادووەکە بەتاڵ ئەبێتەوە.

٤٠٢. ئەڵێن: کوڕی مناڵ بخرێتە باوەشی بووکەوە «نۆسکە»ی ئەو بووکە کوڕ ئەبێ.

٤٠٣. ئەڵێن: کڵاو بە هەڵگەڕاوەیی، «گەسك» لەسەر سەر دانان خراپە و شوومی دێنێ.

٤٠٤. ئەڵێن: یەکێ ئەگەر گوێی ڕاستی بزرینگێتەوە ئەوە باسی ئەکەن، ئەگەر گوێی چەپی بزرینگێتەوە ئەوە گۆڕ بانگی ئەکا.

٤٠٥. ئەڵێن: ئەگەر یەکێ خۆشەویستێکی لە وڵاتێکی دوور بوو، هیچ خەبەرێکی نەبوو، سەرلەبەیانێك بچێتە سەر سێ ڕێیانێك سێ بەرد فڕێ بدا بە نیازی هەواڵێکی خۆشی خۆشەویستەکەی، پاش ئەوە گوێ لە هاتوچۆکەران بگرێ. یەکەم شتێك کە گوێی لێ ئەبێ ئەگەر شتێکی چاك و خۆش بوو، ئەوە خۆشەویستەکەی ماوە و لە خۆشیدایە، خۆ ئەگەر گوێی لە شتێکی خراپ بوو، ئەوە خۆشەویستەکەی لە ناخۆشیدایە، وەیا مردووە!.

٤٠٦. ئەڵێن: هەور، بۆ لەش سووتاو ئازاری زۆر ئەبێ.

٤٠٧. ئەڵێن: پێستی سمۆرە بکرێ بە کیسەپارە سەربەڕزق ئەبێ.

٤٠٨. ئەڵێن: ئێسکی «پەپووسولەیمانە» بخرێتە ناو کیسەپارەوە، ئەو کیسەیە پارەی لێ نابڕێ.

٤٠٩. ئەڵێن: یەکێ تووشی کۆکەڕەشە ببێ شیری کەری بدرێتی چاك ئەبێتەوە.

٤١٠. ئەڵێن: لە ڕێ و بانا مار چاوی بڕیە ئافرەتی سکپڕ ئەو سکە کوڕ ئەبێ.

٤١١. ئەڵێن: کە «با» زۆر بوو تازەبووکێك بچێتە سەربان «باگردێن»ـێك ڕاست بکاتەوە بایەکە ئەوەستێتەوە.

٤١٢. ئەڵێن: کە باران نەبارێ بەیداخی «دارشەخس»ـێك بێنن و لەناو بیرێکا ڕای‌وەستێنن و پاشان بەرد بخەنە ناو بیرەکە باران ئەبارێ.

٤١٣. ئەڵێن: کە بێ بارانی بوو، پیاوچاکێکی لەخواترس بگرن و بیخەنە حەوزەوە باران ئەبارێ.

٤١٤. کە باران نەباری لەو وڵاتی کوردەوارییە «بووکەبارانێ» ئەکەن: بووکە بارانێ ئەوەیە کە منالاَن دارێکی درێژ دێنن و چیتی زەرد و سووری پێوە ئەبەستن و بە مالاَنا ئەسووڕێنەوە. کە چوونە هەر ماڵێك کابانی ئەو ماڵە دێنێ لە سەرەوە ئاو ئەپڕژێنێ لە بووکەبەبارانەکە و دەست ئەبەن شتێکیش ئەدەن بە منالّەکان. هەروەها دێنن لە ماڵەکان دەرزیش ئەدەن لە بووکەبەبارانەکە تا ئەم منالاَنەی گەڕەك وەیا گوندەکە تەواو ئەکەن، یا نەیکەن باران دەست ئەکا بە بارین. تا بارانەکە ئەبارێ بووکە بە بارانەکە لەبەر ئاو لێ پڕژانی ماڵەکان بە تەواوی تەڕ ئەبێ. منالّەکانیش کە ئەچنە بەر دەرگای خەڵك ئەم بەستەیە ئەڵێن: لە هەورامان ئەڵێن:

یا خــوا وارۆ پەی خەلەی     گیــواو بزیۆ پــەی گەلەی

لەو وڵاتی هەولێرە ئەڵێن:

هەبــــاران مەبــــاران     یاخــوا ببــــارێ بــــاران
گەنمی حەسەن وحوسەینان     هەمــوو قڕبــوون لــە تینان

لە وڵاتەکانیتر ئەڵێن:

هەنـــــاران مەنـــــاران     یاخــوا داکاتــە بـــــاران
گەنـــم و جـــۆ بێ بۆ شــاران     کەســمان نەمرێ لە برسان

◈◇◈



عاشقی وشەی خاوێنی کورد، کەلەپیاوی بەدەستوبرد، هۆگری داب‌ونەریتی کوردەواری، کۆکەرەوەی کەلەپوور لە دێهات و شاری، زیندووکەرەوەی شادی، شێخ عەلائەددینی سەججادی.

ناوی «عەلائەددین نەجمەددین عیسامەددین»ە و لە بنەماڵەی ناوداری «سەججادی»یە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان. لە ساڵی ١٩٠٧ی زایینی لە سنەدا هاتۆتە دنیاوە و لە کۆشی خێزانێکی ئایینیدا پەروەردە کراوە. لە ساڵی ١٩٣٨ی زایینی ئیجازەی مەلایەتی لای مامۆستا «شێخ بابەعەلی تەکیەیی» وەرگرتووە و چووە بۆ بەغدا و لە مزگەوتی «نەعیمە خاتوون» بووە بە پێش‌نوێژ. لە بەغداش لای مامۆستایان شێخ «ئەمجەدی زەهاوی» و شێخ «محەممەدی قزلجی» بە هەندێ لە زانستە ئیسلامییەکاندا چۆتەوە. لە ساڵی ١٩٣٩ی زایینیدا چۆتە مەیدانی ڕۆژنامەنووسی و لە ١٩٤١دا بووە بە بەڕێوەبەری گۆڤاری «گەلاوێژ» و وردە وردە بووە بە هەمەکارەی و تا داخستنی لە ١٩٤٩دا لەگەڵی بووە.

لە ساڵی ١٩٤٨دا گۆڤاری «نزار»ی بە عەرەبی و کوردی دەرکردووە، کە گۆڤارێکی نیشتمانپەروەری و سیاسی بووە. تا ساڵی ١٩٧٤ مامۆستای وێژە و مێژووی وێژەی کوردی بووە لە کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا. لە ساڵی ١٩٧٤دا کرا بە ئەمینداری گشتی ئەوقاف و سێ ساڵ لەو کارەدا ماوەتەوە.

ئێوارەی ڕۆژی پێنج‌شەممەی ١٩٨٤/١٢/١٤ی زایینی، کۆچی‌دوایی کردووە و لە گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە نزیکی شێخ عەبدورڕەحمانی ئەبولوەفای نەقشبەندی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی بە کۆشی خاک سپێرراوە.

عەلائەددینی سەججادی زیاتر لە چل ساڵ خەریکی زیندووکردنەوەی کەلەپوور و نووسینی مێژووی وێژەی کورد بوو. تێکۆشانی بێ‌وچانی ئەم پایەبەرزە نەیهێشت کە گەنجینەی کەلەپووری نەتەوەکەمان بفەوتێ.

**ناوی بەرز و ڕۆحی شاد بێت**



انتشارات کردستان
Kurdistan Publication
سنندج ـ پاساژ عزتی ـ تلفن: ٣٣١٦٥٣٨٢




